


میراج چاری ئاکتاش

"مادەم گوڵی پەمەیی لە لقە قاوەییەکانەوە دەگەشێتەوە، کەواتە پێویست بە نائومێدی ناکات."

# بەخێرهاتیتەوە بۆلای خۆت





وەرگێڕانی: نما خۆشناو

به باشی ئاگات له خۆت بێت،

تۆ له هەموو کەسێک زیاتر پێویستت به خۆته



**پێشکەشە بەو کەسانەی ماندووبوون،**
**دەیانەوێتپشوو بدەن، هەست بەباشی بکەن و**
**بێنەوە سەر خۆیان...**





**ئامۆژگاری ئەمڕۆ؛**

**ئەمڕۆ خۆت ئەو گرنگییە بە خۆت بدە کە پێویستتە.**

**پێویستت بە کەس نییە.**

**تۆ بەسیت بۆ خۆت.**

**پێویست ناکات کەسی ترت لەلا بێت.**

**تۆ بەتەنهاش جوانیت.**



**"لەوانەیە ئومێد لە لاپەڕەی دواتری کتێبەکەدا بێت،**
**بۆیە کتێبەکە دامەخە."**
**ژابێس**

لەوانەیە ئێستا بڵێیت؛ میراچ دیسان عاشقی کام کچە بووە وا ئەم کتێبەی نووسیوە و ژان دەکات بە دڵماندا؟ مەترسن مەترس، کەسم خۆشنەویستووە. نەمتوانی کەسم خۆشبوێت. لە ڕاستیدا لە کتێبەکانی تریشمدا نییەتم ئازاردانی ئێوە نەبوو، تەنها ویستم ڕاستییەکانتان بۆ باس بکەم و تەنها ئەوەم کرد. بەڵام ئەم کتێبە کەمێک جیاوازە. هەر وەک گوتم، کەسم خۆشنەویست، نەمتوانی کەسم خۆشبوێت. ئەگەر بپرسن دڵت بووە بە بەرد؟ وابزانم بەڵێ...

هێندە ماندووم کە ناتوانم کەسم خۆشبوێت و هەستەکانم هێندە دوورن لێم کە ناتوانم جارێکیتر لە کەس نزیک ببمەوە. زۆر هەوڵمدا، باوەڕبکە هەوڵمدا کەسێکم خۆشبوێت، پەیوەستبم پێوەی، بیپارێزم و پەسەندی بکەم، بەڵام نەمتوانی. ئەگەر بشڵێن؛ "هەمووی هەر خەتای ئەوانبوو، تۆ هیچ هەڵەیەک و تاوانێکت نییە؟" بێگومان هەمە. منیش بێخەوش نیم. بێگومان منیش هەڵە و کەموکورتیم هەیە، دەبێت هەندێک لایەنم چاک بکەم. من باوەڕم بە بێخەوشی نییە، بۆیە خۆشم ماندووناکەم بە گەڕان بەدوای بێخەوشیدا. تاکە تاوانی من بەها پێدان، پاراستن و هەوڵدانی بەردەوامی یەک لایەنە بوو. لەبەر ئەوەی کەسیش ئەمەی ناوێت من هەمیشە لایەنە دۆڕاو و تەنهاکەبووم.

ماوەیەکی زۆرە نە هەوڵدەدەم کەس بهێنمە ژیانمەوە، نە کەسم خۆشبوێت. واز لەوە بێنن کە کەسێک بهێنمە ژیانمەوە، هەر تاقەتم نییە باسی خۆم بۆ کەس بکەم و خۆم بۆ کەس بسەلمێنم.

وابزانم ئەم ماوەیە وازم لە هەموو شتێک هێناوە. بەڵام ئاوا وازهێنان لە هەموو شتێکیش خۆشە، مێشکم ئاسوودەیە. کەس هەقی نییە بەسەرتەوە. غیرە لە کەس ناکەیت و کەس غیرەت لێ ناکات. نازانیت چیم بەسەر هات و چیم چەشت تا گەیشتمە ئەم قۆناغە. بەڵام لە کتێبەکانی پێشوومەوە دەزانن چیم چەشتووە... بۆ نموونە کۆتا پەیوەندیم... زومرا، ئەوەی لە کتێبی "تۆ تەمەنی حەقدە سالیمی"دا باسمکردبوو...

ئەوانەی ئەو کتێبەیان خوێندۆتەوە ئەم کەسە باش دەناسن، دەشزانن چی بە من کردووە. من کۆتا جار کەسێکی ئاوام هێنایە ناو ژیانمەوە و لە سایەی ئەم کەسەوە زانیم مرۆڤ چەند بێبەزەییە. ئەها گوتم چەندین شتم بەسەردا هاتووە و زۆرم چەشتووە تا گەیشتووم بەم دۆخەی ئێستام؟ با بە کورتی باسی یەکێکیانتان بۆ بکەم.

مامە حیشمەت دەناسیت؟ باپیری زومرا-ی کۆنە خۆشەویستم بوو. بەداخەوە کۆچی دوایی کرد. ئەوم زۆر خۆشدەویست. دوای ئەوەی لەگەڵ زومرا-شدا جیابووینەوە هەر سەردانی مامە حیشمەتم دەکرد. دوای ماوەیەکیش هەواڵی کۆچی دواییم پێگەیشت و بە یەکەم فڕۆکە چووم بۆ مالاتیا (شارێکە دەکەوێتە هەرێمی ڕۆژهەلاتی ئانادۆلو لە تورکیا). دوای چەندین ساڵ بۆ یەکەم جار زومرا-م بینی... منداڵێکی لەگەڵدابوو. سەرەتا کە بینیم هیچ بیرم لەوە نەکردەوە کە هاوسەرگیری کردبێت و منداڵی بووبێت. دەی با بڵێین هاوسەرگیری کردووە، بەڵام هیچ مێشکم

بۆلای منداڵ نەچوو... بەهەرحاڵ هەموو ئەو ئەگەرانەی بیرم لێ نەکردبوەوە یەک یەک ڕاست دەرچوون. هاوسەرگیری کردبوو و کوڕێکیشی بووبوو. بیرێکی لێ بکەرەوە بزانم کوڕەکەی ناونابوو چی؟ دەزانم لە دڵی خۆتدا دەڵێیت "میراچ". ئافەرم، پێشبینییەکی ڕاسبوو. بەڵێ کۆنە خۆشەویستم هاوسەرگیری کردبوو و ناوی منی لە کوڕەکەی نابوو. پێم سەیرنەبوو، هیوادارم ژیانێکی خۆش و بەختێکی باشی هەبێت و کەسایەتی لە دایکی نەچێت.

ئەرکی خۆمم بەرامبەر مامە حیشمەت بەجێهێنا و گەردنیم ئازاد کرد و گەڕامەوە. من خۆمم نیشانی کەس نەدا، بەڵام هەموو شتێکم بینی. ئەم دۆخە منی خەمبارنەکردبوو، بەڵام نازانم سەیربوو بەلامە ناوی منی لە کوڕەکەی نابێت. زۆریش بە خەیاڵمدا نەدەهات، گوتم بەخت و ڕێگەی هەموو کەسێک باشبێت و جارێکیتر ئەم دەفتەرەم داخستەوە.

پوختەی کۆتا پەیوەندی خۆشەویستم: ئێمە جیابووینەوە، کچەکە چوو کەسێکیتری ناسی کە هەمان ناوی خێزانی منی هەبوو و هاوسەرگیری لەگەڵ کرد. ئێمە جیابووینەوە، کچەکە هاوسەرگیری کرد و ناوی منی لە منداڵەکەی نا.

دیارە کێشەکە لە مندایە. من نازانم خۆشەویستی بکەم، وا هەموو جارێک کە بابەتەکە دێتە سەر خۆشەویستی کێشەیەک درووست دەبێت.

نەهامەتی زۆرم بینی و زۆرم چەشت تا گەیشتم بەم دۆخە دەروونی و بێ هەستی و بێباکییەی ئێستا. مەڵێن؛ "ئێ بە تەنها دەمریت؟ بەهۆی کچێکەوە وازت لە دونیا هێناوە و دەرگاکانی دڵت داخستووە". هەرچەندە دڵیشم بشکێت من دڵی کەس ناشکێنم و دەرگاکانم کراوەن. تەنهایی بەس بۆ خودا باشە نەک بۆ بەندەکانی. ڕۆژێک دێت، کەسێک بیرم بخاتەوە کە منیش دڵم هەیە، دووبارە عاشقم بکاتەوە، خۆشم بوێت و تۆوەکانی خۆشەویستی ناو ناخم بژێنێتەوە. بەڵام تا ئەو ڕۆژە ئاوا دەمێنمەوە و بەم شێوەیە زۆر باشم. بۆیە جارێ ئەو شتانە مەخەنە مێشکمەوە. بەڵێ گوتبووم کە ئەم کتێبە جیاوازە. بەڵێ زۆر جیاوازە. من هاتمەوە بۆلای خۆم هاوڕێیان.

هەر وەک دەڵێن؛ "ڕێوی لە کۆتاییدا هەر دەگەڕێتەوە بۆ دوکانی فەروو"، مرۆڤیش دوای چەند کەسێک و چەند ڕووداوێک هەر لە کۆتاییدا دەگەڕێتەوە بۆلای خۆی. منیش ڕێک لە کۆتا وێستگەدام. لەو شوێنەم کە لێی ناترسم و لەوێ هەست بە ئارامیی دەکەم؛ لەلای خۆمم. نە چاوەڕێی هیچ لە کەس دەکەم، نە دەچمە بەردەرگای کەس تا منی خۆشبوێت. وازم لە هەموو شتێک هێناوە. کێ هاتووە، کێ ڕۆیشتووە، کێ خۆشیویستووم، کێ خۆشینەویستووم هەر بەڕاستی هیچیم بە خەیاڵدا نایەت. هەر جارێک دەچمە بەردەم ئاوێنە و سەیری خۆم دەکەم پێکەنین دەمگرێت. دەڵێم؛ بۆ کەس و ڕووداوی چەند بێ مانا خۆتت ماندوو کردووە. چەند خەریکبووم و هەوڵمدا بۆ هێشتنەوەی

ئەو کەسانەی دەیانویست بەجێمبهێڵن، چاوەڕێی خۆشەویستیم لە کەسانێک کرد کە هەر دڵیشیان نییە. چیم نەکرد تا هەندێک کەس تێبگەیەنم کە هەر ناچاریش نەبووم ڕوونکردنەوەیان بۆ بکەم.

چەندین شتیتریش... ئەها گوتم وازم لە هەموو شتێک هێناوە. کێ چی تێدەگات با تێبگات. کێ کێی خۆشدەوێت با خۆشی بوێت. کێ دەیەوێت بۆ کوێ با بڕوات. هەقم بەسەر هیچەوە نییە. پێشتر کاردانەوەم دەبوو، زریانم هەڵدەگیرساند، بەڵام ئێستا هەر لە جێی خۆم ناجووڵێمەوە. چونکە من خۆمم لەبەر زۆر کەس و ڕووداوی بێمانا ماندوو کردووە. ئێستا تەواو یەکلایی بوومەتەوە. بۆیە ئیتر من تەنها لەگەڵ خۆمدا دڵخۆش دەبم. زۆر لە خۆم ناکەم تا کەسم خۆشبوێت. چونکە خۆمم خۆشدەوێت.

ئیتر بەها بە کەس نادەم جگە لە چەند کەسێکی دیاریکراو. چونکە بەها بە خۆم دەدەم. لەم دۆخی ئارامیی و بێ هەستییەدا بە ڕابردووم دەڵێم؛ لەم ژیانەدا کەس بیر لە کەس ناکاتەوە، ئیتر منیش کەس لە خۆم بەبەهاتر نازانم. لەناو قوزاخەی خۆمدام و گوێ لە خۆم دەگرم. ئێستا زۆر هەست بە باشی دەکەم، ئامۆژگاری ئێوەش دەکەم وا بکەن.



**ئەگەر هیچ شوێنێکت نییە بۆی بچیت،**
**ئەوا وەرەوە بۆلای خۆت.**
**بە زووترین کات وەرەوە، بە خۆشویستنی خۆت**
**نیشانیان بدە کە خۆشەویستی دەبێت چۆن بێت!**

## باشبوو کە هەیت.

دەزانم پێشتر زۆر خەمباریان کردوویت، دەشزانم زۆر ماندوو و دڵشکاویت. دەزانم ئەوانە بەجێیان هێشتوویت کە هیچ باوەڕت نەدەکرد بەجێت بهێڵن، خۆشەویستیت بە هەدەرچووە و ئەمەکەکانت بەفیڕۆ چووە.

دەزانم کە بۆت دەرکەوتووە ئەوانەی واتدەزانی جیاوازن و متمانەت پێ دەکردن هیچ جیاوازییەکیان نییە لەگەڵ خەڵکیتردا و پەشیمانیان کردوویتەتەوە لەوەی هەر متمانەشت پێکردوون. دەشزانم هەندێک جار ناتوانیت ڕستەیەک بدۆزیتەوە کە باسی دڵشکاوییەکانت بکات. خەمت نەبێت زۆر باش تێدەگەم کە هەست بە چی دەکەیت و بیر لە چی دەکەیتەوە.

بزانە کە من لەگەڵتم. دەمەوێت دڵنیابیت لەمە. ئەمە وەک ئەو "لەگەڵتا"دە نییە کە سەرەتا کەسانیتر پێیان دەگوتیت. من بە ڕاستی لەگەڵتم. هەرچییەکیشم لەدەستبێت دەیکەم بۆ ساڕێژکردنی برینەکانت. چونکە هەموو کەسێک دەڕوات، بەڵام من هەرلەلات

دەمێنمەوە. لەوانەیە بە خەیاڵی کەسدا نەیەیت. لەوانەیە کەسیش خۆشینەوێیت. بەڵام خەم مەخۆ، من خۆشمدەوێیت، تۆ گرنگیت لەلام. زۆریش گرنگیت. باشبوو کە هەیت. کەس لە تۆ بە بەهاتر نییە و لەم ژیانەدا هیچ هاوشێوەیەکت نییە. ئەمانە لەبیرنەکەیت.

**ئەگەر کەسیشت لەلا نەبێت، من هەر لەلاتم.**
**ئەگەر کەس خۆشینەوێیت، من خۆشمدەوێیت.**
**ئەگەر کەسیش بەهات پێنەدا، بۆ من هەر بەبەهایت.**
**خەم مەخۆ، با ئەوان شەرم لە خۆیان بکەن کە**
**بەهای تۆیان نەزانیوە.**
**ئەوانەی تۆیان بەجێهێشت کەسیتری**
**وەک تۆیان دەستناکەوێتەوە.**
**دووبارە دەڵێمەوە؛ باشبوو کە هەیت.**

**ئەوانەی لایەکیان کەمە،**
**نە بە ڕۆیشتنی کەس دەڕوخێن، نە بە**
**خۆشنەویستنیان...**
**چونکە ئەو هێندە شتی لەدەستداوە**
**کە لە لەدەستدانی کەس ناترسێت.**

تەمەنم بیست و پێنجساڵە، تا ئەم تەمەنە بەبێ بینینی خۆشەویستی باوک گەورەبووم... لەلایەن هاورێکانمەوە، کەسانی دەورووبەرم و جار جاریش کەسانی ناو خێزانەکەمەوە زۆر بە کەم بینرام و بە کەمیان زانیم.

من لەو منداڵانە نەبووم کە چیان بویستایە بۆیان دەکرا و کام یارییان داوا بکردایە بۆیان دەکڕدرا. لە ڕاستیدا هەر منداڵیم نەژیام. هەر کاتێک منداڵێک دەبینم، ئەو منداڵییەمم دێتەوە یاد کە نەمتوانی بژیم و لە دڵمدا مایەوە. بۆیە هەمیشە منداڵەکان جێگەیەکی جیاوازیان هەیە لەلای من. هیچ کاتێک بەندەرێکم نەبوو کە لە بچووکترین کێشەدا پەنای بۆ ببەم و خۆمی تێدا حەشاربدەم. هەمیشە پەنام بۆ خۆم دەبرد. خۆم هەموو برینەکانمم سارێژکرد. بێ باوکیم هەر لە ناخمدا شاردەوە. دوای ماوەیەک ئەم دۆخەش ئیتر ئازاری نەدەدام و ڕاهاتم لەگەڵیدا.

چاوەڕێی هیچ شتێکی ماددی لە کەس ناکەم. یەک پەیوەندی و هەواڵپرسین بەسمە بە زیادیشەوە. ئەمە گەورەترین سەروەتە بۆ من. بەڵام کەس ئەمەی نەزانی. دوای ماوەیەک من بەم ئازارەش ڕاهاتم. لەوانەیە ئەمە هۆکاری بەهێزی من بووبێت. کەسێک کە بەبێ باوک گەورە دەبێت هیچ شتێک و نەبوونی هیچ کەسێک نایڕوخێنێت. ناتوانیت بە هیچ بەجێهێشتنێک و بە هیچ خۆشنەویستنێک ئەو کەسە بترسێنیت. چونکە ئەو

لەگەڵ گەورەترین ئازاری ژیاندا ڕاهاتووە. بە گەورەترین خۆشنەویستراوی ڕاهاتووە.

ئیتر کام ئازارە دەتوانێت ئەو بڕوخێنێت؟ بەڕای من هێزی هیچ کەسێک لە سەروو هێزی کەسێکەوە نییە کە بەبێ باوک گەورە بووە. کاتێک باوکم ئێمەی بەجێهێشت دایکم من و خوشکەکەمی پاراست. بۆیە زۆر فشاریان لە دایکم کرد. دەیانگوت؛ "باوکی ئەمانە پیاو نەبوو ئێستا بەتەمایت ئەمانە ببن بە پیاو؟" بە تایبەتی داپیرەم و باپیرم زۆر فشاریان لەدایکم دەکرد تا ئێمە بدات بە لانەی بێسەرپەرشتان، و دەیانگوت ئەگەر وانەکات ئەوا هەموومان دەردەکەن لەو ماڵە.

دایکێک پێی باشترە لە کۆڵاندا بمێنێتەوە لە جیاتی ئەوەی منداڵەکانی بداتە لانەی بێسەرپەرشتان. و ئەوانیش ئێمەیان دەرکرد. ڕێک فڕێیاندراینە کۆڵان و لەوێ ماینەوە. تێکۆشانی دایکێکی ئاوا کە بەرگەی ئەو هەموو فشار و سەختییەی گرتووە و خۆی نەیخوارد و نەیخواردەوە، بەڵام ئێمەی تێرکرد، منی گەیاندووە بەم ڕۆژە. سەرەڕای ئەو هەموو ئازارە بۆ ساتێکیش کۆڵمنەدا، لە ڕێگە لامنەدا و لە ناو ئەو هەموو سەختییەوە هاتمە دەرەوە و گەیشتم بەم ڕۆژە.

ئەها هەموو کاتێک لێم دەپرسن، سەرەڕای ئەم هەموو شتە؛ چۆن دەتوانی بە بەهێزی بمێنیتەوە؟ چۆن دەتوانیت پێبکەنیت؟

ڕێک لە سایەی ئەو ڕووداوانـەی بۆم باسکردن. لە سایەی ئازارەکانمەوە.

مرۆڤێک هێندەی قوڵی ئازارەکانی بەهێزدەبێت و بە جوانی پێدەکەنێت. وتەیەکم خوێندەوە دەڵێت؛ "ئەو کەسانەی بە جوانی پێدەکەنن، ناخیان پارچە پارچەیە..." زۆر ڕاستە...

**بێگومان ئەو کەسانەی بەبێ باوک گەورە دەبن بەهێزترین کەسانی دونیان.**

**کاتێک ئازار چواردەورت دەگرێت**
**ئەم وتانەی 'ڕەشاد نوری گونتێکین' بهێنەرەوە یادت:**
**"بیر لە درێژترین و بێچارەترین شەوت بکەرەوە.**
**دوای ئەویش خۆر هەر هەڵنەهات؟"**

## خەمت نەبێت هەموو شتێک تێدەپەڕێت.

تەنها بە توندی باوەش بە ئازارەکەتدا بکە. چونکە ئەو تۆ بەهێزتر دەکات. هەروەک چۆن هەموو ئەوانەی پێشتر گوتت تێناپەڕێت و تێشپەڕین ئەمیش ئاوا تێدەپەڕێت. تۆ چەند سەختیت تێپەڕاند، دڵت چۆن بەسەر ئەوانەیتردا زاڵبوو، ئاوا بەسەر ئەمەشدا زاڵدەبێت. خودا تا کێو نەبینێت بەفری تێناکات، خەمت نەبێت ڕۆژێک دێت خودا بەفری سەر کێوەکەی تۆش بتوێنێتەوە. تۆ بەتەنها توانیت لە هەموو ئازارە سەختەکان ڕزگارت ببێت. بە تەنها هەموو ئەو شتانەت تێپەڕاند کە دەتگوت؛ "ناتوانم ئەمەیان تێبپەڕێنم". بەتەنها هەموو ئەمانەت کرد. لەوانەیەی ئەوانەی هاتنە ژیانتەوە زۆر ئازاریان دابێتیت. لەوانەیە ئازارەکانت زۆر ماندوویان کردبێتیت. لەوانەیە کاتێک زۆر پێویستت بەوە بووە کە باوەش بە کەسێکدا بکەیت باوەشت بە خۆتدا کردبێت.

لێت ئەپرسم، لەگەڵ کام ئازارەدا ڕانەهاتیت کاتێک دەتگوت من ناتوانم لەگەڵ ئەم ئازارەدا بژیم؟ لەگەڵ هەموویدا ڕاهاتیت و بەتەنها هەموویانت تێپەڕاند. ئەوانەی دەیانگوت؛ "لەلاتم" ئەو

ڕۆژانەی پەلەقاژەت دەکرد تا ئازارەکانت تێبپەڕێنیت کەسیان لەلات نەبوون. ئەو کەسەی لە هەموو کەسێک زیاتر حەزت دەکرد لەلات بێت و لە کاتێکدا کە لە هەموو کاتێک زیاتر پێویستت پێی بوو لەلات نەبوو. لەبیری مەکە، ئەمەش تێدەپەڕێت. تۆ وەک هەموو جارێکیتر ئەمەش تێدەپەڕێنیت. تۆ هێندە بەهێزیت کە هیچ ئازارێک ناتوانێت بتڕوخێنێت.

**ئەو شاخانەم ڕوخاند کە لە ڕۆژە سەختەکانمدا نەمدەتوانی پاڵیان پێوە بدەمەوە.**
**گوتتان؛ "لەلاتم". بەڵام من لە هەموو ئازارەکانمدا بەتەنها بووم.**

## خۆت بە دوور بگرە.

خۆت لەو کەسانە بەدوور بگرە کە نازانم چیان دەوێت و هەست بە چی دەکەن، تەنها بیر لەخۆیان دەکەنەوە و خۆپەرستن. خۆت لەو کەسانە بەدوور بگرە کە چێژ لە خەمباری دەبینن، بە خۆشەویستی جوان نابن و لە بچووکترین شتدا مەیلی ڕۆیشتن دەکەن. خۆت لەو کەسانە بەدوور بگرە کە نازانن دڵت چاکبکەنەوە، کاتێک تۆ هەوڵی چاککردنی ئەوان دەدەیت ئەوان تۆ دەڕوخێنن، هەوڵ دەدەن تۆ بگۆڕن و فیداکاریت بۆ ناکەن. خۆت لەو کەسانە بە دوور بگرە کە ئاژەڵەکانیان خۆشناوێت، قسەکانیان و کردەوەکانیان یەکناگرێتەوە، ئەوانەی بەهات پێ نادەن و هەمیشە ناچاریت ڕوونکردنەوەیان پێ بدەن لەبارەی خۆتەوە. خۆت لەو کەسانە بەدوور بگرە کە هەوڵدەدەن ناچارت بکەن بەپێی خواستەکانی ئەوان هەڵسوکەوت بکەیت، هەست بە خۆشەویستییان ناکەیت، نازانن داوای لێبوردن بکەن و بە لووت بەرزییەوە سەیری هەموو کەسێک دەکەن. خۆت لەو کەسانە بەدوور بگرە کە متمانەت پێناکەن، متمانەت پێ نابەخشن و تۆ لە پێش هەموو شتێکەوە نیت بۆیان.

لە ڕاستیدا دەمویست زیاتریش بنوسم، بەڵام دەترسم پەڕەکانی کتێبەکەم بەشنەکات. ئەگەر چاوت بە کەسێک کەوت کە تەنها یەکێک لەم تایبەتمەندییانەشی تێدایە ئەوا خۆت بەدوور بگرە لێی.. هەوڵدان لەگەڵ ئەو کەسانەی خاوەن ئەم تایبەتمەندییانەن هیچ جیاوازییەکیان نییە لەگەڵ ئەوەی ئاوی بەردێک بدەیت و چاوەڕێبیت گوڵ دەربکات.

**خودا کەسێک بکات بە نسیبی دڵتان کە**
**بە دڵباشی و نییەتی باشەوە دێت بۆلاتان...**

## مرۆڤ کەی هەستدەکات گەورەبووە؟

سەیرکە؛ 'نیلگون مارمارا' چۆن وەڵامی پرسیاری؛ "مرۆڤ کەی هەستدەکات گەورەبووە؟":

"ئێستا شقارتەیەکیش ناسوتێنیت بۆئەو ڕووداوانەی پێشتر نۆ گوندت بۆ دەسوتاند.

فێربوویت کە خۆڕاگربیت و سەرت لە هیچ ناسوڕمێت.

لەڕاستیدا، ئەو ڕۆژەی هەستتکرد کە ئیتر سەرت لە هیچ شتێک ناسوڕمێت، ئەو ڕۆژەیە کە هەستدەکەیت گەورەبوویت."

بەڵێ، ئیتر منیش گەورەبووم. هەر لە سەرەتاوە دەتوانم درۆ و ڕاستی، خوار و ڕێک، ئەو ڕووداو و کەسانەی دەکرێت من خەمبار بکەن ببینم و لەیەکیان جیا بکەمەوە. هێندە شتم بینیوە کە مرۆڤەکان بێبەزەییانە و بێ ئەوەی بۆ ساتێکیش بیری لێ بکەنەوە ئەنجامیانداوە، ئیتر سەرم لە هیچ شتێک ناسوڕمێت. هیچ کاردانەوەیەکم نییە بۆیان. ناتوانم لەبارەی هیچ کەسێکەوە بڵێم؛ "ئەو شتی وا ناکات". چونکە زۆر باش دەزانم دەیکات. لەوانەیە ئازاری زۆرم چەشتبێت تا گەیشتووم بەم

قۆناغە، بەڵام ئێستا هەر گەڵایەکیش لە جێی خۆی ناجوڵێنم بۆ ئەو ڕووداوانەی ئەگەر پێشتر بەسەرمدا بهاتایە زریانێکم بۆ هەڵدەگیرساند. وازم لە هەموو شتێک و هەموو کەسێک هێناوە. چونکە هەموو کەسێک لەسەر ڕێگەی خۆی و بەو شێوەیەی خۆی جوانە... وە ئەمە زۆر بە ڕوونی دەبینم. ئیتر هێزی ئەوەم نییە هەوڵ بدەم بۆ بینینی نییەتی باش لە هیچ کەسێکدا. من ئیتر گەورەبووم. سوپاسی هەموو ئەوانە دەکەم کە بەشداربوون لە گەورەکردنمدا.

**ئێستا شاخێک هەیە لە نێوان من و ئەو کەسانەی ڕۆژانێک بەیەکەوە بێستانمان دروستکرد.**
**سەیرکە، ئەمەش جۆرێکی گەورەبوونە.**

## فرێی مەدە، بەڵکو چاکی بکەرەوە.

هەمیشە لەگەڵ ئەوەدابووم کە شتە خراپبووەکان چاکبکەمەوە نەک یەکسەر فڕێیبدەم. بۆ نمونە ئەگەر کۆنترۆڵی تەلەفیزیۆنەکە کار نەکات، ئەوا سەرەتا هەڵیدەوەشێنم و سەیرێکی ناوەکەی دەکەم. یان سەیری جێگەی پیلەکەی دەکەم، نازانم ئیتر هەوڵدەدەم چاکی بکەمەوە. لە پەیوەندییەکانیشمدا هەر ئاوام. ئەگەر کەسی بەرامبەر بیەوێت بڕوات و کۆتایی پێ بهێنێت من هەر پرسیاری هۆکارەکەی دەکەم. هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نەبووم لە ناکاو هەموو شتێک بسڕمەوە و فڕێیبدەمە تەنەکەی خۆڵەوە. بەڵام هەرگیز هێندە بێ غروریش نەبووم لەشوێنێک بمێنمەوە نەویستراوبم لەوێ. هەوڵم بۆ چاککردنەوەی هەموو کەسێک دا. بەڵام ئەوانەشم فڕێدایە سەتڵی ڕیسایکلینەوە کە خۆیان هەر بە شایەنی تەنەکەی خۆڵ دەزانی، و بوونە ئەزموونێک بۆم.

ڕۆژێکیان لە ژن و مێردێکی بەتەمەنیان پرسیوە:

"بۆ ماوەی شەست و پێنج ساڵ چۆن بەیەکەوە ژیاون و هیچ جیانەبوونەتەوە؟"

ژن و مێردە بەتەمەنەکە گوتویانە:

"ئێمە شتەکانمان چاک دەکردەوە فڕێمان نەدەدا".

باشە ئێستا ئاوایە؟ نەخێر. هەموو کەسێک بەدوای کەموکورتی و خاڵی لاوازی ئەوانەیتردا دەگەڕێت. بۆیە هەندێک کەس خۆشویستنی یەکتریان لەیاد کردووە. هەموو کەسێک بەم شێوەیە سەیری ئەو کەسانە دەکات کە دەیانهێنێتە ناو ژیانییەوە؛ "بوون و نەبوونی وەک یەکە بۆ من." وە ڕێک ئاوایە. بۆیە بە خۆڕایی نەیانگوتووە هەر بە تەمەنەکان ڕاست دەکەن.

**هەر بەڕاست، هەر بە تەمەنەکان ڕاست دەکەن.**

# با ناخت ئاسوودە بێت

تۆ بۆچی خۆت خەمبار دەکەیت؟ نابینی ئەو ژیانی خۆی دەژی؟ تۆ بۆچی ئەو ژیانە دەکەیت بە زیندان لە خۆت کە هێندەی تەمەنی پەپولەیەک کورتە، لەبەر کەسێک کە هیچ شایەنی ئەوە نییە؟ شایەنی ئەوەیە هێندە خۆتی بۆ ماندوو بکەیت؟ جارێکیتر دێتەوە ئەم ژیانە؟

تۆ بە هەموو هەستەکانتەوە هەرچیت لەدەستهات کردت. هەموو جارێک بەو عەشقەی ناو دڵتەوە چوویتەوە بۆلای ئەو.

ئەو هەموو کێشەیە هەبوو بەڵام هەر لەگەڵ ئەودا مایتەوە. بەڵام لە بچوکترین شتدا ئەو ڕووی لە دەرگاکە کرد. کاتێک تۆ هەموو شتێکت دەکرد بۆ دڵخۆشکردنی ئەو، ئەو تۆی لە ناو ئەو هەموو ئازارەدا بەجێهێشت. ئەو شایەنی یەک دڵۆپە فرمێسکیشت نییە. وەرەوە سەر خۆت. کاتێک تۆ زیاد لە پێویست خەم بۆ کەسانیتر دەخۆیت کەس خەم بۆ تۆ ناخوات، هەرگیز ئەمە لە یاد مەکە. وە لەبیرتبێت کە ئەو شایەنی تۆ نییە. باوەش بە تەنهاییتدا بکەیت باشترە لەوەی کەسێک لە ژیانتابێت کە قیمەتت نازانێت. ئەو هەر شایەنی کەسانی وەک خۆیەتی. با تۆ ناخت ئاسوودە بێت. وازی لێ بێنە با ئەوان بخاتە شوێنی تۆ. با تێربێت لە خەڵکیتر. تۆ خۆت تێریت لە خۆشەویستی ساختە.



**کاتێک یەک دنیا شت هەیە کە دەمویست پێت بڵێم،**
**پڕ بە قورگی خۆم بێدەنگبووم.**

## چاوەڕێی هیچ مەکە تا مێشکت ئاسوودە بێت...

کاتێک ڕادێیت بەوەی بە تەنها بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ ببیت، کاتێک بە تەنها ئەو شتانە تێدەپەڕێنیت کە دەتگوت؛ "ناتوانم ئەمە تێبپەڕێنم، کاتێک ژیان چەندین جار بیرت دەخاتەوە کە هیچ شتێک لە تۆ بەنرختر نییە، کاتێک دەبینیت ئەو کەسانەی خۆشتویستوون شایەنی ئەو خۆشەویستییە نەبوون و لە کۆتاییدا تێدەگەیت لەوەی دەبێت تەنها خۆتت خۆشبوێت، ئیتر پێویستت بە کەس نامێنێت. ئەم قۆناغە زۆر خۆشە. چاوەڕێی هیچ لە کەس ناکەیت و مێشکت ئاسوودەیە.

**پێویستیم بە کەس نییە.**
**خۆم هەموو شتێکم چارەسەر کرد.**
**ئیتر چاوەڕێی هیچ لە کەس ناکەم.**
**ژیان ئاوا خۆشترە...**

**"کەس گوێ بەوە نادات کە چۆن بەرەنگاری شەپۆلەکان بوویتەتەوە.**
**تەنها گوێ بەوە دەدەن کە کەشتییەکەت گەیاندووەتە بەندەرەکە یان نا".**

ڤیکتۆر هۆگۆ

کەس نازانێت تۆ چیت چەشتووە، نازانێت بە ناو چ ئازارێکدا تێپەڕیویت، بە تەنها بەسەر چیدا زاڵ بوویت، باوەڕم پێبکە ئەگەر بیشیزانێت هەر گرنگ نییە لەلای. ئازار و برینی هەرکەس بۆخۆی قوڵە.

پێدەکەنیت، وادەزانن دڵخۆشیت. نازانن لە ژێر ئەو پێکەنینەدا چ ئازارێک، وێرانەیەک و دڵ شکاوییەک هەیە. بۆیە هەوڵمەدە هیچ بۆ کەس بسەلمێنیت و ڕوونی بکەیتەوە، گوێ بە کەس مەدە.

پەلەقاژە بۆ کەس مەکە. خۆت ماندوو مەکە. مرۆڤەکان هەر ئەوە دەکەن کە لە بەرژەوەندی خۆیاندایە، گوێی مەدەرێ. ئەوان هێندەی بەرژەوەندییەکانیان خۆشیاندەوێت. هەر کە بەرژەوەندییەکانیان تەواوبوو خۆشەویستی ئەوانیش تەواو دەبێت و دەڕۆن.

تۆ وەک هەموو جارێک بەلەمەکەت لە دەریا شەپۆلاوی و زریاناوییەکان ڕزگار دەکەیت و نزیکی دەکەیتەوە لە بەندەرەکە. پێت دەڵێن ناتوانیت بیکەیت و دەیکەیت. بە سەربەرزییەوە هەموو ئەو ڕێگرییانە تێدەپەڕێنیت کە پێت دەڵێن ناتوانیت ئەمەیان تێبپەڕێنیت.

**هەر وەک مەولا دەڵێت:**
**"لەگەڵ نەزاندا مشتومڕ مەکە، یا تورەت دەکات،**
**یان ئادابت بە زایە دەدات."**

## پرسەم بۆ دابنایتایە؟

وابزانم چاوەڕێی ئەوەبوویت کە ڕۆشتیت من بڕوخێم، ژیانم وێران ببێت، پرسەت بۆ دابنێم، بە ئازارەوە بتلێمەوە و ئەمانە؟ نەخێر هەرگیز شتی وا ناکەم. نە خەم دەخۆم بۆ ڕۆشتنی کەسێک خۆی بە بێ منی ڕاهێناوە، نە دەجەنگم بۆ بەدەستهێنانەوەی کەسێک کە بوێری لەدەستدانی منی هەبێت. هەندێک شت دەڵێیت کە تەنانەت بەهانەش نین و دەڕۆیت و چاوەڕێیت خەم بۆ ڕۆیشتنت بخۆم، بیرت بکەم و کەس نەخەمە جێگەت؟ هەرگیز واناکەم. ئەو ڕۆژانە تێپەڕین. ئەو ڕۆژانە تێپەڕین کە هەوڵم دەدا بۆ هێشتنەوەی ئەوانەی بڕیاریاندابوو بڕۆن. ئیتر ئەو هەوڵانە نادەم و خۆم ماندوو ناکەم. ئەو زەمەنە بەسەرچوو. ئیتر کێ چی بە من بدات ئەوەی دەدەمەوە. هیچ شتێکی زیاد لە پێویست بە کەس نادەم. ئیتر دڵم تێرە لە خۆشەویستییە هەست پێنەکراوەکان.

**چیتر خەم بۆ ئەوانە ناخۆم کە دەڕۆن.**
**بەڵکو کەسی باشتر دەخەمە جێگەیان.**

## لە لوتبەرزیمدا نییە،
## بەڵکو بەهۆی ڕێزی خۆمەوەیە دەڕۆم.

لە تۆ دەڕۆم، بەڵێ لە تۆ دەڕۆم. هەندێک کات دەکرێت مرۆڤ هەم بە نابەدڵییەوە بڕوات و هەم بە خۆشحاڵیشەوە بڕوات. لەگەڵ باشتر لەمە تێگەیشتم.

دەمگوت کە دەمەوێت لەگەڵ تۆ بم، دەترسام لەوەی تۆ لەدەست بدەم، بەڵام من نامەوێ شەڕ لەگەڵ خۆپەرستی و بێ هەستی تۆ بکەم. لە لوتبەرزیمدا نییە، بەڵکو بەهۆی ڕێزی خۆمەوە دەڕۆم. وامدەزانی باش دەبێت بۆم، بۆیە هەنگاوم بۆ نایت، بەڵام بۆم دەرکەوت بە خۆشویستنی تۆ ئەشکەنجەی خۆمم دەدا. ئێستا باشتر ئەوە دەبینم. من پەیوەندییەکم ناوێت کە بەهۆی هەوڵەکانی منەوە لەسەر پێ ماوە، هیچ نزیکییەک و پەیوەندییەکم ناوێت کە بەهۆی تەلەفۆنەکانی من و هەواڵپرسینی منەوە لەسەر پێ ماوە. ئەم جارەیان جیاوازە، ئەم جارە زویرنیم لێت.

کاتێک هەبوو لە لەدەستدانی تۆ دەترسام، بەڵام ئێستا بوێری لەدەستدانی تۆشم هەیە.

من واز لە تۆ دەهێنم. ڕێگەت کراوە بێت.



**مرۆڤ هەندێک جار دەڕوات.**
**هەرچەندە خۆشیشی دەوێت.**
**ئەو کەسەی بە خۆشەیستییەوە دەڕوات،**
**شتی زۆری لە دڵدا شاردۆتەوە.**
**بەڵێ بێدەنگ دەبێت،**
**ئەو شتانەش لەگەڵ خۆیدا دەبات**
**کە شاردویەتییەوە و دەڕوات.**

## تاقەتم نەماوە

کە بیرمکردەوە، بینیم چەند مرۆڤی نا پێویستم هێناوەتە ژیانمەوە. بۆ کەسی چەند نا پێویست خۆم ماندووکردووە. خۆشمویستوون، بەهام پێداون، فیداکاریم بۆ کردوون، بەڵام لە بەرامبەردا بێوەفاییەکی گەورەیان کرد. بەڵام ئێستا زۆر بە ڕوونی دەیبینم کە من هەر خۆمم ماندوو کردووە. ئێستا سەیردەکەم هەموو کەس لەگەڵ یەکتردا دڵخۆشە.

منیش دانیشتووم فیداکارییەکانم و تێکۆشانەکانم دەژمێرم کە لە کاتی خۆیدا کردوومە. خۆمم سەرقاڵکردووە بۆ کەسانێک کە دوای ماوەیەک هەر بە خەیاڵیشیاندا نایەم. هەر خۆمم ماندوو کردووە. شایەنی ئەوە بوون؟ نەخێر. ئیتر هەر بە خەیاڵیشمدا نایەت کێ هاتووە، کێ ڕۆیشتووە، کێ خۆشیویستووم و کێ خۆشی نەویستووم. کێ چۆن دڵخۆشە با ئاوا بمێنێتەوە. کەستان گوێتان لەو زریانانە نەگرت کە کاتی خۆی هەڵمگیرساندن. ئیتر کە ئێوەش زریان هەڵدەگیرسێنن من گەڵایەکیش لە جێی خۆی ناجوڵێنم. من هێزی شەڕکردنم هەیە لەگەڵ ئێوە، بەڵام تاقەتم نەماوە.



**وازم لە ڕابردوو هێنا.**
**ئیتر تەنها سەیری داهاتووم دەکەم.**

## ئەمانە هەر بەسەر مندا دێت؟

لە ڕاستیدا هەموو شتێک هەر بەسەر تۆدا نایەت. تەنها تۆ وا بیردەکەیتەوە کە هەموو شتێک هەر بەسەر تۆدا دێت. ژیان تەنها؛ ئازار، دەرد و خەم نییە. مرۆڤ لە ژیانیدا دڵخۆشیش دەبێت. بۆ نموونە تەمەنی هەندێک دڵخۆشی هێندەی تەمەنی پەپولەیەک کورتە. بەڵام هەر ئارەزووی دەکەین. لە کاتی دڵخۆشیماندا بۆ ساتێکیش پرسیاری هۆکارەکەی دەکەین؟ نەخێر. بەڵام لە بچووکترین ئازار و خەمدا یەکسەر دەست بە ناڕەزایی دەربڕین دەکەین.

ئەمە لە بیر مەکە: ئارامگری لە ڕۆژانی سەختدا، لە سوپاسگوزاری ڕۆژانی خۆشی بە بەهاترە. چەند ڕازیت بەوەی پێت بەخشراوە دەبێت ئەوەندەش ڕازی بیت بەوەی لێتسەندراوەتەوە.

ئیتر ئەمە مرۆڤە، لە ڕۆژی خۆشدا دڵخۆشدەبێت و پرسیاری هۆکارەکەی ناکات، بەڵام لە کاتی ئازار و ڕۆژی ناخۆشدا یەکسەر دەڵێت؛ "بۆچی من؟" وەرن با باسی چیرۆکەکەی ئارثەر ئاش-تان بۆ بکەم.

ئارثەر ئاش یەکەم پاڵەوانی ویمبڵدۆن-ی ڕەشپێستە، بەهۆی گواستنەوەی خوێنەوە توشی نەخۆشی ئایدز بووبوو و لە سەرەمەرگدابوو. لە سەرتاسەری جیهانەوە هەوادارەکانی نامەیان بۆ دەنارد.

لە یەکێک لەو نامانەدا هەوادارێکی دەپرسێت: "خودا بۆچی نەخۆشییەکی ئاوا خراپی بۆتۆ هەڵبژاردووە؟" ئارثەر ئاش لە وەڵامدا دەڵێت: "لە هەموو جیهاندا پەنجا ملیۆن منداڵ دەست بە یاری تێنس دەکەن. پێنج ملیۆنیان فێری یاری تێنس دەبن. پێنج سەد هەزاریان دەبنە یاریزانی تێنسی کارامە، پەنجا هەزاریان دەچنە پێشبڕکێکانەوە، پێنج هەزاریان دەگەنە پاڵەوانێتییەکان، پەنجایان دەگەنە ویمبڵدۆن، چواریان دەگەنە نیوەی کۆتایی، دوانیان دەگە فیناڵ. کاتێک کاسی پاڵەوانێتیم بە دەستەوە گرت هیچ لە خودام نەپرسی "بۆچی من؟" بۆیە ئێستا چۆن بتوانم لە کاتی ئازار و ژاندا لێی بپرسم؛ "بۆچی من؟"

**"دڵخۆشی مرۆڤ شیرین دەکات. سەرکەوتن بریقەداری دەکات.**
**سەختی بەهێزی دەکات. خەم مرۆڤ دەکات بە مرۆڤ.**
**دۆڕان لوتبەرزیی ناهێڵێت.**
**هەرگیز لە خودا مەپرس؛ "بۆچی من؟"**
**هەرچییەک ببێت هەر دەبێت..."**

- ئارثەر ئاش

**بگەڕێرەوە بۆ ڕابردوو.**
**داوای لێبووردن لە خۆت بکە.**

سوپاسی خودا بکە، چیت دەکرد ئەگەر هێشتا ئەو کەسانەت لە بیرنەکردایە کە دەمێکە لە بیرت کردوون و تێتپەڕاندوون؟ یان ئەگەر هیچیان تێنەپەڕینایە؟ یان ئەگەر هێشتا لەبەردەم ئەو دەرگایانەدا بوەستایتایە کە بەڕووتدا داخراون؟ بگەڕێرەوە بۆ ڕابردوو و داوای لێبووردن لە خۆت بکە، لەبەر ئەوەی خۆتت بۆ کەسانێک ماندوو کردووە کە هیچ شایەنی نەبوون، بەهات بە کەسانێک داوە کە هیچ شایەنی نەبوون، متمانەت بەو کەسانە کرد کە نەدەبوو متمانەیان پێ بکەیت و ئەو کەسانەت خۆشویست کە نەدەبوو خۆشتبوێن، بۆ هەموو شتێک خۆتت خەمبار کرد، تۆ هەمیشە شت دەبەخشی بەوان وهیچت لێ وەرنەدەگرتن، بەردەوام تاک لایەنە هەوڵتدا بۆ چاککردنەوەی شتەکان، دەتگوت با ئەوان دڵخۆشبن، کێشە نییە ئەگەر من خەمباریش ببم. داوای لێبووردن بکە تا دووبارە هەمان هەڵە نەکەیتەوە. هەمان هەڵە مەکەرەوە تا زیاتر خۆت خەمبار نەکەیت.

**دەبێت لە هەموو کەس زیاتر لەخۆت خۆش ببیت.**
**چونکە تۆ ڕێگەت بە هەموو ئەو شتانە دا.**

## ناڕازی مەبە، سوپاسگوزاربە.

هەندێک کات لە هەندێک شت ناڕازیت، هەرچییەک دێتە بەردەمت بە دڵت نییە. ناڕازیت لە ژیانت و ئەو نیعمەتانەی تێیدایت لەو ساتەدا. هەندێک کات شەش ڕۆژ لە هەفتەیەکدا کار دەکەیت و ڕۆژی پشووت دێت، کە چاوت دەکەیتەوە سەیر دەکەین باران دەبارێت و ناڕازی دەبیت لەمە. دەبینیت کەسانێک دڵخۆشن لەگەڵ ئەو کەسانەی هێناویانەتە ژیانیانەوە، ئیرەییان پێدەبەیت و ناڕازی دەبیت. نان دەخۆیت، تامەکەیت بەدڵ نابێت و ناڕازی دەبیت. ناڕازی دەبیت لەو شتانەی کە تەنانەت بەهانەش نین بۆ ناڕازی بوونت.

هێندە ڕادێیت لەگەڵ ناڕازیبووندا، سوپاسگوزاریت لە بیردەچێتەوە. لە ڕاستیدا باشترین چارەسەر سوپاسگوزارییە، بەڵام تۆ نایزانیت. تۆم ڕۆبینس دەڵێت؛ "ژیان هەرگیز ئەوەت پێشکەش ناکات کە دەتەوێت، پێشکەشیشت بکات نەگونجاوییەکی هەر تێدا دەبێت. یان کاتەکەی هەڵەیە، یان شوێنەکەی، یانیش مرۆڤەکە هەڵەیە."

ئەگەر ئەوانەی تۆ دەتەوێت نایەن بۆ لات، ئەوا چاوەڕێ مەکە، بەڵکو تۆ بچۆ بۆ لایان. بە ناڕازیبوون لە هەموو شتێک ناتوانیت بگەیت بە هیچ. با باسی چیرۆکی ڕۆژنامەنووسێک و

پیاوێکی تەمەن سەد و دوو ساڵت بۆ بکەم.

ڕۆژێکیان ڕۆژنامەنووسێک دەچێت بۆ ماڵی پیاوێکی سەد و دوو ساڵ تا چاوپێکەوتنێکی لەگەڵدا ئەنجام بدات.

کاتێک دەچێتە ژوورەوە سەرەتا پرسیاری نهێنی ئەو تەمەن درێژی و هۆکاری تەندرووستیی و قینج و قیتی و دڵخۆشی لەم تەمەنەیدا لێ دەکات. ڕۆژنامەنووسەکە چاوەڕێی وەڵامێکی لەم شێوەیە بوو؛ "هیچ جگەرەم نەکێشاوە، خۆمم ماندوو نەکردووە، ماستم زۆر خواردووە و ماستاوم خواردۆتەوە، بەیانیان وەرزشم کردووە".

بەڵام پیاوە پیرەکە بەم شێوەیە وەڵامی ڕۆژنامەنووسەکە دەداتەوە و دەڵێت؛ "کوڕم، هەموو ئەو ڕۆژانەی خودا بە منی بەخشیوە زوو لە خەو هەڵدەستم و بە سوپاسکردنی خوداوە دەڕۆم بەرەو پەنجەرەکەم. دوای ئەوەی یەک دوو خوولەک پشوو دەدەم هەمیشە ئەمە بە خۆم دەڵێم؛ 'ئەمڕۆ ڕۆژێکی شاهانەیە، ڕێک وەک ئەوەیە کە من دەمەوێت'. جا کەشوهەوا خۆشبێت یان نا، خۆر و هەتاوبێت یان باران ببارێت، ساردبێت یان گەرم".

جا مەبەستم ئەوەیە؛ خۆرەتاوە و تۆ پەردەکانت داداوەتەوە، خەریکیت خۆت دەخنکێنیت بە دەردێک کە هێندەی دەنکە گەنمێکیش نابێت. هەستە پەردەکان لاببە، بڕۆرە بەردەم پەنجەرەکە. گوێ لە دەنگی باڵندەکان بگرە. هەست بە خۆر بکە لەسەر پێستت. بەڵام لەو ژوورە تاریکەدا مەمێنەرەوە. ئەم

ناهەقییە بەرامبە خۆت مەکە.

ئەگەر بارانیش بباریت هەرگیز پەردەکات دامەدەرەوە. هەر پەردەکانت لاببە و سەما بکە لەگەڵ باراندا.

وە بەدڵنیاییەوە بە خۆت بڵێ؛ "ئەو ژیانەی من لێی ناڕازیم لەوانەیە خەیاڵی کەسێکیتر بێت... داوای لێبووردن دەکەم خودایە..."

**سەیرکە ؛عارف نیهات ئاسیا؛ دەڵێت چی:**

**"باڵندەکانم بینی کاتێک ئاو دەخۆنەوە لە هەموو قومێکدا**

**دەنووکیان بەرز دەکەنەوە بۆ ئاسمان و**

**سوپاسی خودا دەکەن."**

## تاقەتم نییە.

ئەگەر پێشتر بوایە هەوڵم لەگەڵدا دەدا، گرنگیم بە هەندێک شت دەدا، خۆم سەرقاڵ دەکرد پێیانەوە. ئێستا وازم لە هەوڵدان هێناوە بۆیان، تاقەتم نییە قۆڵیشم بەرز بکەمەوە بۆیان. ئێستا ئەو کەس و ڕووداوانە هێندە گەورە ناکەم لەبەرچاوم و هەر ئەوانیشبوون وایان کرد من بگەم بەم قۆناغە. ئێستا ئاوەکانم هێندە مەنگن کە هەندێک جار خۆشم بە زیادە دەبینم بۆ خۆم. 'چارلس بوکۆفسکی' بەم شێوەیە ئەو دۆخە ڕۆحییەی کورتکردۆتەوە کە تێیدام؛ "ئەو پشتگوێخستنەی ئێستام ئەنجامی گرنگیپێدانێکی زۆری کاتی خۆیەتی". کە ئاوام هی ئەوەیە پێشتر زۆر هەوڵم لەگەڵ هەندێک شتدا داوە...

زیاد لە بەهای خۆیان خۆشمویستن... بە هەندێک نزام گوت؛ "ئامین" کە هەرگیز گیرا نابن. هەندێک شتم لەبەر جاوی خۆمدا گەورە کرد کە هەر نەدەبوو بیانبینم. بەڵام ئێستا هیچ لەو کاتەم ناچم. چونکە هیچم لەدەست نایەت بۆ کەس و بۆ هیچ شتێکی بکەم.



**بێ باکییەکی وەک بێ باکییە شیرینەکەی 'جان یوجێل'م بۆ هاتووە کاتێک دەڵێت:**
**"هێندە ورد مەبنەوە لە ژیان، ئەگەر ویژدانتان پاکە، و دڵتان جوانە، ئەوا بۆخۆتان بژین و تەواو."**

## کاتی خۆی دێت.

هەرگیز ئەو ڕۆژانە لە یاد ناکەم کە ئەو کەسانەی وەک ناوی خۆیان دەیانزانی پێویستم پێیانە پشتیان تێکردم و ڕۆیشتن. هەموو ئەو کەسانەم لە یادە کە منی لەگەڵ خۆمدا جێهێشت، لە کاتە سەختەکانمدا لەگەڵم نەبوو و بە دوای بەهانەدا گەڕان بۆ ڕۆیشتن. من ئەوانە لە بیرناکەم کە بەرامبەرم کراوە. کەسێکی کیندار نیم بەڵام هەرگیز ئەوانەم لەیاد نەکردووە کە بەرامبەرم کراوە. ئەگەر ڕۆژێک هات و دڵخۆشبووم، ئەوا منیش دەست بۆ ئەو کەسانە درێژ ناکەم کە لە ناوەڕاستی ئازار و تەنهاییدا منیان بەجێهێشت و ڕۆیشتن و لەلام نەبوون. ئەمە تۆڵە سەندنەوە نییە، بەڵکو هەڵسوکەوتکردنە وەک ئەوان. ڕۆژێک منیش هەمان شت دەکەم بەرامبەر ئەوان. وە یەک یەک تێیان دەگەیەنم کە جێهێشتنی کەسێک کاتێ پێویستی پێتە چەند ناخۆشە. ئەویش کاتی خۆی دێت.

**ئەوانەی کاتی خۆمم بۆ تەرخانکردن،**
**پلانی خۆمم بۆ تێکدان و بەدەم هەموو پێویستییەکیانەوە ڕۆیشتم.**
**کاتێک بابەتەکە هاتە سەر من و من پێویستم پێتانبوو**
**چۆن یەکسەر خۆتان ونکرد؟**

## ئەگەر سەر ناگرێت ئەوا زۆری لێ مەکە گیانەکەم

ئەگەر سەر نەگرێت زۆری لێ ناکەم. ئێستا وەک پێشتر نیم. پێشتر ئەگەر بشمزانیایە سەر ناگرێت هەر کەمێک زۆرم لێ دەکرد. هەر خۆمم ماندوو دەکرد تەنها بۆ ئەوەی دواتر نەڵێم خۆزگە ئەوەشم بکردایە. تەنها هەستکردنم بەس نەبوو بۆ ئەوەی بزانم ئەو شتە سەرناگرێت. دەبوو هەتا کۆتایی هەوڵی لەگەڵدا بدەم و خۆم بە چاوی خۆم بمبینیایە کە سەرناگرێت. هەرگیز کۆڵم نەدەدا هەتا دەگەیشتمە ئەو قۆناغە. ئێستا ئیتر وا نیم. هەر کە زانیم سەرناگرێت ئیتر واز لە هەوڵدان دەهێنم. ڕێک لەو شوێنەدا ڕوونتر دەبینم کە کەس شایەنی هیچ شتێک نییە. تەنها خۆم ماندوو دەکەم بۆ کەسانێک و ڕووداوێک کە هیچ شایەنی ئەوە نین خۆمیان بۆ ماندوو بکەم.

**لەو کاتەوەی وازم هێناوە لە هەوڵدان بۆ**
**کەسانێک کە شایەنی نین، هیچ ماندوو نەبووم.**
**خۆ من هەر بە خۆڕایی خۆمم ماندوو کردووە.**
**ئێستا باشتر لەمە تێدەگەم.**

## لەبەر هیچ کەسێک مەگۆڕێ،
## تۆ ئاوا جوانیت.

ناتوانیت کەس بگۆڕیت. خۆ قوڕی دەستکرد نین بە دڵی خۆت شێوەیان بگۆڕیت. من پێم وایە کە خۆشەویستی و بەهای ڕاستەقینە بریتییە لە قبوڵکردنی شتەکان و کەسەکان وەک ئەوەی هەن. بیری لێ بکەرەوە، کەسێک دێتە ژیانتەوە، تۆ سنووردار دەکات، پێت دەڵێت ئەمە لەبەرمەکە، ئەوە لەبەرمەکە، قسە لەگەڵ ئەم مەکە، قسە لەگەڵ ئەو مەکە. بەردەوام هەوڵدەدات ویستەکانی خۆیت بەسەردا بسەپێنێت. هەندێک کەس ئەمە بە خۆشەویستی ڕاستەقینە دەزانن. وا نییە هاوڕێیان، وا نییە. ئەوە خۆشەویستی نییە، ئەوە نەخۆشییە. ئەوە خۆپەرستییە. ئەگەر ڕێز و متمانە هەبێت بەرامبەر یەکتر ئەوا جوانترین خۆری خۆشەویستی لەوێوە هەڵدێت. با کەسانێک هەبن لە ژیانتدا کە هەوڵی گۆڕینی تۆ نادەن، بەڵکو بەو شێوەیەی هەیت تۆیان قبوڵە و خۆشیاندەوێیت. مرۆڤ وەک باڵندەیە لەلای من. بیر لە باڵدەیەک بکەرەوە کە پەیوەستە بە ئاسمانەوە و عاشقی ئاسمانە. ئەگەر لە کاتێکدا کە باڵەکانیشی نەشکاوە هەر لەلای تۆ مایەوە و

نەفرۆی ئەوا بەڕاستی تۆی خۆشدەوێت. ئەمە هەموو بابەتەکەیە... ناتوانی کەس بخەیتە ناو قەفەزەوە بەهۆی دڵپیسیتەوە. خۆی ئەمە هەر دڵپیسی نییە، خۆپەرستییە. ئەمە خۆشەویستیش نییە.

**عاشق شتێکی هێندە سەیرە،**
**کە هەمان کەس هەم دەتخاتە خۆشییەوە،**
**هەم دەتخاتە ئازارەوە.**

## من تۆم بۆ دایکم باسکرد

هەموومان دەزانین کە بابەتەکە هەرچییەک بێت ژنان هەستیارانەتر سەیری دەکەن بە بەراورد بە پیاوان. ناڵێم پیاوان بێهەستن. تەنها باسی ئەوە دەکەم کە ژنان هەستیارانەتر سەیری ڕووداوەکان دەکەن. بۆ نمونە ئەگەر ژنێک باسی تۆ بۆ دایکی بکات ئەوا بەڕاستی خۆشیدەوێیت. ئەمە هیچ ڕوونکردنەوەیەکیتری نییە. ئەگەر کەسێک هێندە تۆی خۆشدەوێت کە لەلای دایکی باست بکات ئەوا هەرگیز ئەو خۆشەویستییەی لەدەست مەدە. ئەم ژنانە لەدەست مەدەن. بێگومان هەستیاری ماندووکەرترین شتی ئەم دونیایەیە... هەرچەندە کوڕیشم بەڵام منیش کەسێکی هەستیارم. ئایا ئەمە هیچی بە من بەخشیوە؟ نەخێر. بەپێچەوانەوە هەر شتم لەدەستداوە بەهۆیەوە. هەموو شتێک و هەموو کەسێک کە هەستیارانە هەڵسوکەوتم لەگەڵ دەکرد، وانەیەکی جوانیان دادام. لە ئەنجامدا، فوو لە ماستیش دەکەم ئینجا دەیخۆم. بەڵام ماستیش ئاوا خۆشە. هەندێک کات هەستەکانی خۆت هێندە زیانت لێ دەدەن خۆشت ناتوانیت لەو دۆخە بێیتە دەر.

باسی ژنانمان کرد و گوتمان کە هەستیارن. بەڵام ژنی بێ هەستیش هەیە. ژنیش هەیە کە بەهۆی ئەو پەشیمانی و ئازارانەی چەشتویەتی بێ هەستیی کردووە بە قەڵغانێک بۆ پاراستنی خۆی.

هەندێک ژن هەیە کە لە ڕاستیدا هەستیارە، بەڵام بەهۆی ئەو ڕووداوانەی بەسەریدا هاتووە زویر بووە لە هەموو کەسەکانی ژیانی. هەندێک ژن هەیە کە بە تەواوی دڵی کردۆتەوە بۆ ئەو پیاوەی خۆشیدەوێت و دواتریش ئازاری چاکی چەشتووە. با ئەو ژنانە خەمبار نەکەین. دواتر زۆر بێبەزەیی دەبن. یەکێک لە جوانترین ساتەکانی ژنێک ئەو ساتەیە کە باسی خۆشەویستەکەی بۆ دایکی دەکات، با ئەو ساتەیان لێ تێکنەدەین.

**بەهۆی ئەو کچانەی گوڵ بۆ هەموو کەسێک دەبەنەوە، ئەو کچانە خەمبار مەکەن کە ئێوە بۆ دایکیان باس دەکەن.**

## کەسە ناپێویستەکان بسڕەرەوە لە ژیانتدا

هیچ جێگەیەکت نییە لە ژیانی ئەواندا. هیچ واتایەکت نییە لەلای ئەوان. ئەوە هیچ گرنگیش نیت بۆیان. بەردەوامییت لە ژیانی خۆیان وەک ئەوەی هیچ نەبوو بێت. هەر بە خەیاڵیاندا دێت تۆ خەمباربوویت، گریاویت یان بێزاربوویت؟ نەخێر. تۆ بۆچی خۆت خەمبار دەکەیت بۆ کەسانێکی بێ بەها و کەسانێک کە هەر هیچ بەهای تۆ نازانن. ئەوان بەبێ تۆ دەتوانن بژین، تۆش وەک گوڵ دەتوانی بەبێ ئەوان بژیت. مادەم ئەوان کەسیتر دەخەنە جێی تۆ، تۆش دەتوانیت کەسی باشتر بخەیتە جێی ئەوان. نابێت خۆت بۆ کەسی ناپێویست خەمبار بکەیت. ئەوە بزانە کەسیان خەم بۆ تۆ ناخۆن کاتێک تۆ خەمباردەبیت. ئەوان گیانیان هەیە ئەی ئەوەی تۆ چییە؟ بەشی پێویست ماندوو نەبوویت؟ وەرە تۆزێک دانیشە. هەناسەیەک بدە. لاپەڕەیەکی تازە هەڵمەدەرەوە بۆ خۆت. بەڵکو دەفتەرێکی تازە بکرە. لە یەکەم پەڕەشیدا بنووسە؛ "لەمەودوا لە خۆم زیاتر گرنگی بە هیچ کەسێک نادەم". لە بیری مەکە، هەندێک کەس شایەنی ئەمەن. وە تۆش دەتوانیت ئەوەیان پێبدەیت کە شایەنین. کەسە ناپێویستەکان بسڕەرەوە لە ژیاندا گیانی من. دەی فرمێسکەکانت بسڕە. تۆ بە پێکەنینەوە جوانتریت.



**هەرچەندە سەری نەدەگرت،**
**بەڵام تۆ هەر هەوڵت لەگەڵدا دا.**
**ئەمەش بەسە بۆ ویژدانی تۆ.**

## سەیرکە حەزرەتی علی چی دەڵێت: "ئارامگرتن ملکەچکردن نییە، تێکۆشانە."

خەمبار دەبیت، تەنانەت زۆریش خەمبار دەبیت. خۆشتدەوێت، زۆریشت خۆشدەوێت، بەڵام ئەو تۆی خۆشناوێت.

بەهایان پێدەدەیت و هەست بە بێ بەهایی دەکەیت. متمانەیان پێدەکەیت، پەشیمانت دەکەنەوە. خەڵکیتر دڵخۆش دەکەیت و خۆت فرمێسک دەڕێژیت. لەوانەیە بەجێت بهێڵن. ڕۆژێک دێت دۆستەکانت لە پشتەوە چەقۆت لێ دەدەن. ڕۆژێک خۆشەویستەکەت بەجێت دەهێڵێت، هاوڕێکانت لێت تێناگەن. خێزانەکەت تۆ ماندوو دەکات. هەموو ڕێگاکانت لێ دەگیرێت. دەتەوێت ڕازی دڵت بۆ کەسێک باس بکەیت، بەڵام کەس لە چواردەورت نەماوە. بە ماوەیەکدا تێدەپەڕیت کە هەموو شتێک بەسەر یەکەوە ڕوودەدەن. هەندێک لە ڕاستییەکان وەک زلەیەک دەدەنــەوە بـەڕووتـدا و دەکەویتە سـەر زەوی. بـەڵام چۆن کەوتوویت ئاواش دەتوانیت هەستیتەوە سەرپێ. خەمت نەبێت، چۆن بەسەر ئەوانەیتردا زاڵبوویت ئاوا بەسەر ئەمەشدا زاڵ دەبیت. حەزرەتی عەلی دەفەرموێت: "ئارامگرتن ملکەچکردن نییە، تێکۆشانە."

تۆش دەبێت ئارامبگریت لە بەرامبەر ئەم هەموو ئازار و سەختییەدا. لەوانەیە وا بیربکەنەوە کە ملت کەچکردووە، بەڵام تۆ تێدەکۆشیت. نابێت کۆڵبدەیت. دۆڕاوەکان کۆڵدەدەن، تۆ نابێت بدۆڕێیت. نابێت واز لە تێکۆشان بهێنیت. ئەگەر تۆ وازبهێنیت ئەوانە دەیبەنەوە کە هیچ شایەنی نین. تۆش نابێت ڕێگە بەمە بدەیت.

**یاریزانی بۆکسێنی بەناوبانگ، محمد علی دەڵێت:**
**"یاریزانی بۆکسێن کە کەوتە سەر زەوی نادۆڕێت بەڵکو کە نەیتوانی هەستێتەوە دەدۆڕێت".**

**"بێ ئومێد مەبە؛ لەم ژیانەدا کۆتایی هەموو شتێک دەبێتە هۆی دەستپێکردنی شتێکیتر"**
لۆڤ هاپنس

ئەگەر سەرەتا پێت بگوتمایە کە بە تێروتەسەلی باسی ڕۆیشتنت لای من دەکەیت بۆ خەڵکی، ئەوا هەرگیز نەدەهاتمە سەر ڕێگەت، نەدەهاتمە ژیانتەوە. هێندە بەهام پێنەدەدایت. ئەو خۆشەویستی و دڵەم بە تەواوەتی نەدەخستە بەردەمت کە بە ئاسانی پێشکەشی کەسم نەدەکرد. سەیردەکەم وا بۆ خەڵکی

دەردەخـەیت کە دوای من ئیسراحەتت کـردووە و ئاسوودە بوویت. یەکێک نەزانێت بە زۆر تۆم لەلای خۆم هێشتۆتەوە. خۆت بە ویستی خۆت هاتیتە ناو ژیانمەوە و واتدەرخست کە دڵت هەیە و هەڵتخەڵەتاندم. بە ڕای من پێویست بە هەڵسوکەوتی ئاواش ناکات دوای چوونە دەرەوەت لە ژیانم. گوتت کە منت خۆشدەوێت، بەڵام وەک ناوی خۆم دەزانم منت خۆشنەویستووە. بەڵام من لە جیاتی هەردووکمان تۆم خۆشویست. بەڵام هەرگیز ئەمەت نەزانی؛ من بەم خۆشەویستییەی خۆم بێ دڵی تۆ و ئەو ڕاستییەم شاردەوە کە منت خۆشناوێت. تۆ بەردەوامبە لەوەی بە خەڵکی بڵێیت من پەڕەیەکی تازەم هەڵداوەتەوە. هەروەک 'شەبنەم فەڕەح' دەڵێت؛ "لە سەرەتاوە بیسڕەرەوە. ژیان سفر بکەرەوە..." من لەوێوە ژیانم سفرکردەوە و دەستم بە ژیانێکی بێ تۆیی کرد.

**'مێرلن مۆنرۆ' چەند جوان گوتویەتی:**
**"وە هەندێک کات شتە باشەکان تەواو دەبن،**
**تا شتی باشتر دەستپێبکات."**

## هیوادارم کەسێک بێتە سەر ڕێگەت
## کە بە جوانی خۆشیبوێیت

هەر وەک چۆن ئاو ڕێگەی خۆی دەدۆزێتەوە، دوو کەسیش ئەگەر بە ڕاستی یەکتریان خۆشبوێت ئەوا عەشقیش وەک ئاو ڕێچکەی خۆی هەر دەدۆزێتەوە. پێمانوایە هەرچەندە بیروڕای جیاوازیشیان هەبێت، بیرۆکەکانیان یەکنەگرێتەوە، بەڵام هێزی خۆشەویستی لە سەروو هەموو شتێکەوەیە و بە هیچ نابەزێندرێت. مرۆڤ کاتێک خۆشەویستی لە بەرژەوەندی خۆی نابێت بە گشتی ئەم ڕستەیە دەڵێت: "ئێمە خەڵکی دوو دونیای جیاوازبووین."

هەمیشە ئەم ڕستەیەم بە بێمانا زانیوە. هەرگیز بە خۆشەویستەکەیان نەگوتووە؛ "من و تۆ پڕهەستترین پەڕەی کتێبێکین."، "چوانترین کۆپلەی گۆرانییەکین". سییەکانیان پڕ دەکەن لە بۆنی گوڵ، بەڵام کاتێک دێتە سەر دڕکەکانی بە کەڵکی ئەوان نایەت و دەست دەکەن بە بەهانە هێنانەوە.

لەوانەیە ئەمە قسەیەکی کلاسیک بێت، بەڵام زۆر بە مانایە؛ "ئەوەی گوڵی بوێت دەبێت بەرگەی دڕکەکەشی بگرێت". ئەگەر

بڵێت گوڵم خۆشدەوێت و کە دڕکەکەیت بینی بگەڕێیتەوە دواوە، ئەمە خۆشەویستی نییە. ئەوە هەر هەوەسە. نابێت مرۆڤ بە هەوەسێکی دوو ڕۆژی بڵێت خۆشەویستی. نابێت بۆنی گوڵەکە بکەیت، بەڵام بترسیت لەوەی دڕکەکەی بچێت بە دەستتدا و ئازارت بدات، خۆشەویستی ئاوا ناکرێت. ئەگەر دڕکی ئەو گوڵەی خۆشت دەوێت ئازارت دەدات ئەوا دەبێت ئازارەکەشیت خۆشبوێت. هەر جوانیتان خۆشنەوێت. بە جوانی خۆشتانبوێن. هەر چاکییەکانیان نا، هەڵەکانیشیانتان خۆشبوێت. هەمیشە کامڵییەکانیانتان خۆشنەوێت. بە کەموکورتییەکانیشیانەوە خۆشتانبوێن.

**'ئۆزدێمیر ئاساف' گوتویەتی:**

**"هەموو کەسێک بە زیادەوە خۆشیویستووە، بەڵام من بە کەموکورتییەکانیشییەوە خۆشمویست..."**

**ئێستا هێندە بە باشی لێت تێدەگەم...**

## "یان ڕەش بە، یان سپی.
## من بەرگەی ڕەساسی ناگرم."

داوام لێ مەکە وا هەڵسوکەوت بکەم وەک ئەوەی لە ژیانمدابیت، لە کاتێکدا کە هەر لە ژیانمدا نیت. یان ڕەش بە، یان سپی. هەوڵمەدە ڕەساسی بیت. با دیاربێت چ ڕەنگێکیت. ئەگەر خۆشتدەوێت ئەوا دەریببڕە و هەستی پێ بکە. دەرگایەک بە کراوەیی بۆ من بەجێمەهێڵە و ئومێدم پێ مەدە و لەولاشەوە لەگەڵ خەڵکیتردا کات بەسەر مەبە. ئەگەر خۆشت ناوێم ئەوا هەر ناویشم مەهێنە. ناوم مەهێنە تا گوێشم نەزرنگێتەوە. با منیش خەریکی ژیانی خۆم بم. منیش ژیانێکم هەیە کە بەبێ تۆش دەکرێت بەردەوامبم لێی. من ژیانی خۆمم هەیە و هەوڵ مەدە لێم تێکبدەیت. دڵنیام لە سووچێکی ژیانی ئێوەشدا یان لە ڕابردووتاندا کەسێکی ئاوا هەر هەیە. ئێوەیان خۆشناوێت، بەڵام دەیانەوێت ئێوە ئەوانتان خۆشبوێت. بۆ ساتێکیش لە ژیانتاندا نەبووم، بەڵام دەیانەوێت وا هەڵسوکەوت بکەن کە لە ژیانتاندان. لە هەمان کاتیشدا کات لەگەڵ خەڵکیتردا بەسەر دەبەن. لە ناکاو خۆیانتان نیشان دەدەن و یەکسەر ون دەبنەوە و بە خۆڕایی

ئومێدتان پێ دەدەن. سوور دەزانن کە پێویستتان بەوانە، بەڵام هەر لەلاتان نابن. بەڵام کاتێک کەسێکیتر پێویستی بەوان دەبێت یەکسەر ڕادەکەن بۆلایان. بەڵام هاوڕێیان هەموو شتێک دەکەوێتەوە سەر ئێمە.

ئەگەر ئێمە بمانەوێت ئەوان هەن و ئەگەر نەمانەوێت نامێنن.

**ئەو کەسانەی نامخەنە گومانەوە و نیشانەی پرسیارم لەلا درووست ناکەن، هەمیشە بەبەهان بۆ من.**

**"هێندە پێگەیشتووم کە بتوانم لە مرۆڤەکان خۆش ببم، بەڵام هێندە گەمژە نیم کە دووبارە متمانەیان پێبکەمەوە"**

ولیام گۆڵدینگ

ڕابردووی من پڕە لەو کەسانەی پەشیمانم لەوەی متمانەم پێکردوون، خۆشمویستوون و بەهام پێداون. متمانەم بە کەسانی هەڵە کرد، نائومێد بووم. بەهام بە کەسانێکدا کە نەدەبوو بەهایان پێ بدەم و من بێ بەها بووم. کەسانی هەڵەم خۆشویست و هەرگیز خۆشنەویستram. ناتوانن بیزانن هاوڕێیان، لە سەرەتادا ناتوانن بزانن کێ چۆنە. لە سەرەتادا وا دێن بۆلاتان ناتوانیت باوەڕیان پێ نەکەیت. ڕستەی جوان و بریقەدار، بەڵێنی بەتاڵ کە هەرگیز نابرێتە سەر، ئیدی بریقەدار...

بە کورتییەکەی باوەڕ بە هەموویان دەکەین. بە تایبەتی ئەگەر هەستیاربن، زۆر جوان ئەمە بەکاردەهێنن. زۆر درەنگ تێدەگەیت لەوەی کەسێکت خۆشویستووە کە نەدەبوو خۆشتبوێت و ئازاری زۆر دەچێژیت. کە بێ ئومێد دەبیت ئینجا تێدەگەیت متمانەت بە کەسێک کردووە کە نەدەبوو متمانەی پێ بکەیت. بەڵام ئەو کاتە کار لە کار ترازاوە. بۆیە ژمارەیەکی زۆر کەس هەیە کە هەرگیز لێیان خۆشنابم. ڕۆژێک لە ڕۆژان منیش ستەمم کرد و گوتم؛ "خودایە ئەم بەندانەت زۆر ئازاریاندام، منیان لە هەموو چاکەکانم پەشیمان کردەوە. من لەوان خۆشبووم بەڵام تۆ لێیان خۆش مەبە".

دواتر بیرملێکردەوە و گوتم 'میراچ' لەم دونیایەدا بەشی پێویست خەریکیانبوویت و کاتت بەفیڕۆدا بۆ ئەو کەسانە... نامەوێت لەو دنیاش ئەو کەسانە بێنەوە سەر ڕێگەم کە نەک نامەوێت دەموچاویان ببینم بەڵکو هەر نامەوێت ناویشیان ببیستم. لێیان خۆشببە خودایە لێیان خۆشببە. من لێیان خۆشبووم، تۆش لێیان خۆشببە.

گەردنیشیان ئازاد دەکەم، بەس تۆ لێیان خۆشببە.

**هەمووان من بە گەمژە دەزانن،**
**چونکە لەوانە خۆشبووم کە بەرامبەرم کرا.**
**بەڵام نازانن لێخۆشبوون گەرەترین تۆڵەی منە لەوان.**

پێش ئەوەی بڕیار لەسەر خەڵک بدەیت ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەرمان (د.خ) بێنەرەوە یادت: "ئایا دڵیت لەتکردووە و سەیری ناوەکەیت کردووە؟"

کام فەرمووده و کام وتەی پێغەمبەرمان (د.خ) بۆ ئەم سەردەمەش گونجاو نییە؟ هەموو وتەکانی هێندە لەسەر حەقن مرۆڤ دەخنکێت لە ناو جوانییاندا؛ چەند جوان فەرموویەتی؛ "ئایا دڵیت لەتکردووە و سەیری ناوەکەیت کردووە؟" بەڕاستی زۆر بە شانسین کە پێغەمبەرێکی هێندە جوانمان هەیە...

ناتوانیت ناخی ئەو کەسانە پاک بکەیتەوە کە ناخیان پڕە لە حەزی بوختانکردن و ناشرینکردنی خەڵک. دەمی کەسیان تورەکە نییە تا گرێی بدەیت. ئەم کەسانە زۆر ئارەزووی قسەکردن دەکەن، بێ گوێگرتن بڕیار لەسەر هەموو کەسێک دەدەن. هیچ هەوڵ نادەن تێبگەن، هەموو شتێک بەو شێوەیە دەبینن کە دەیانەوێت بیبینن.

با ئەمەش بڵێم و لە دڵمدا نەمێنێتەوە، هەموو ئەو هەوڵانەی دەیدەن بۆ گۆڕینی ئەم کەسانە جگە لە ماندووکردنی ئێوە بە کەڵکی هیچیتر نایەن. هەروەها هیچ لایەکی پەسەندکراویان نییە، ئەمەش مەسەلەیەکی تەواو جیاوازە. دەتوانن باسی چی بۆ ئەو کەسانە بکەن کە دەیانەوێت ئێوە وەک ئەو کەسە ببینن کە خۆیان دەیانەوێت، بەو شێوەیە ڕووداوەکان دەبینن کە خۆیان دەیانەوێت هەرچەندە ڕاستییەکەشی دەزانن، یان تەنها باوەڕ بەو شتانە دەکەن کە خۆیان دەیانەوێت؟ هەر بە خۆڕایی هەناسەی خۆت بەفیڕۆ دەدەیت؟ چارەسەرەکەی زۆر ئاسانە، ئەو کەسانە لە ژیانت دەردەکەیت و لە خۆت بەدووریان دەگریت.

**کوێربە بەرامبەر ئەوانەی تۆ نابینن،**
**کەڕبە بەرامبەر ئەوانەی ناتبیستن،**
**بێ دڵبە بەرامبەر ئەوای خۆشیانناوێیت.**
**ئاوا زۆر خۆشترە. دەیبینیت.**

## هەرچۆنێک بێت،
## هەموو کەسێک دەڕوات کاتێک بەرژەوەندی
## لەگەڵت نامێنێت

ئەوانەی یەکەم کەس ڕۆیشتن هەر ئەوانە نەبوون کە دەیانگوت؛ "هەرگیز ناڕۆم"؟ ئەوانەی ئێمەیان خۆشنەدەویست هەر ئەوانە نەبوون کە دەیانگوت؛ "من لە هەموو کەسێک زیاتر خۆشم دەوێیت"؟ دەڕۆن گیانەکەم، هەموو کەسێک دەڕوات. یان خۆشەویستی نامێنێت و دەڕوات یان بەرژەوەندی. لە هەموو کەس زیاتر دەبێت لەوانە بترسیت کە دەڵێن ناڕۆم. چۆنکە ئەوانەی دەڵێن ناڕۆم لە هەموو کەس زیاتر دەڕۆن. هەندێکیان ئەجەلیان دێت و دەڕۆن، هەندێکیشیان کەسێکیتر دەدۆزنەوە و دەڕۆن. لە ئەنجامدا هەموو کەس بە شێوەیەک هەر دەڕوات، تۆ بۆخۆت بە تەنها دەمێنیتەوە. دۆست قسەی ڕەقە.

پێویست بە درۆ ناکات. سەرەتا ئەم پرسیارە لە خۆت بکە: "کام لەوانەی دەیانگوت ناڕۆم لەلام ماون؟" دواتریش ئەگەر توانیت وەڵامی بدەرەوە، هەموو جارێک ڕۆیشتنی ئەوانەمان نەبینی کە دەیانگوت ناڕۆم؟ خۆشنەویستنی ئەوانەمان نەبینی کە دەیانگوت خۆشمدەوێیت؟ بێگومان لەم ژیانەدا ئەگەریش هەیە.

تەنانەت زۆربەی لەو شتانە پێک دێت کە تەنها بە ئەگەرمان زانیوە... بەڵام هەندێک ڕاستی گەردوونیش هەیە، بۆ نموونە هەموو کەسێک ڕۆژ هەر دەڕوات... ئێمە خۆمان گەورەترین هەڵەمان کرد، با ئاگادارتان بکەمەوە.

کاتێک کەسێک دەهێنینە ژیانمانەوە هێندە خۆشمان دەوێت و پەیوەست دەبین پێوەی وەک ئەوەی هەرگیز نەڕوات و بەجێمان نەهێڵێت. تەنانەت زۆر کات هێندە خۆشماندەوێت کە دەڵێین؛ "لەمەودوا چۆن دەتوانم بەبێ ئەو بژیم؟" بەڵام ڕۆژێک ئەویش دەڕوات. ئێمەش بۆخۆمان ئاوا بەتەنها دەمێنینەوە. کەستان وا خۆشنەوێت وەک ئەوەی هەرگیز نەڕوات. بە پێچەوانەوە هەمیشە بزانە ڕۆژێک هەر دەڕوات. کاتێک خۆشت دەوێت بزانە هەر دەڕوات تا کە ڕۆیشت هێندە ئازار نەچێژیت.

سەیرکە؛ ناڵێم کەست خۆشنەوێت، خۆشتبوێ. بەڵام وا خۆشت نەوێت وەک ئەوەی هەرگیز نەڕوات، وا خۆشتبوێت کاتێک ڕۆیشت تۆ نەڕووخێیت.

**باوەڕ بەوانە مەکە کە دەڵێن ناڕۆم.**
**هیچیش هەوڵمەدە بۆ هێشتنەوەی**
**ئەو کەسانەی دەیانەوێت بڕۆن.**
**خۆت ماندوو مەکە. تەنها پێیان بڵێ:**
**"دەرگاکە لەوێوەیە."**

**"کاتێک کرم گوتی؛ گەیشتمە کۆتایی ڕێگە،**
**خودا کردویەتی بە پەپولە.**
**کەسمان ناتوانین بزانین چ خۆشییەک چاوەڕێمانە."**

گۆڕان شتێکی ئاساییە و ناتوانین خۆمانی لێ لابدەین. هەندێکمان ناتوانێت گۆڕانی دۆخی، ژیانی و هەر شتێکی ناو ژیانی قبوڵ بکات. هەوڵدەدات بەردەوامبێت لە ژیان بە هەمان شێوەی خۆی. نە هەوڵدەدات خۆی بناسێت نە بەشە شاراوەکانی ژیان ببینێت. لە ڕاستیدا ژیان زۆر لەوە زیاترە کە دەردەکەوێت و مرۆڤیش زۆر لەوە بەهێزترە کە بیری لێ دەکرێتەوە. هێندە تەرکیز دەخەینە سەر ئەو شتانەی خۆمان دەمانەوێت بیبینین ئەو موعجیزە و جوانیانە نابینین کە بەلاماندا دەڕۆن و تێدەپەڕن. لە ڕاستیدا ئەگەر وزەی خۆمان بۆ ناسینی خۆمان و ژیان بەکاربهێنین لە جیاتی ئەوەی بۆ بەرەنگاربوونەوەی گۆڕان بەکاریبهێنین دەبینین کە شتەکان زۆر جیاوازترن. واز هێنان لە ڕابردوو تاکە شتە کە دەبێت بیکەین. دەبێت ئاسوودەبین و سەیری بەردەممان بکەین. وە لە هەمووی گرنگتر نابێت خۆمان بە کەسێک بزانین کە هەر واشنین.

دەمەوێت باسی چیرۆکێکتان بۆ بکەم لەمبارەیەوە. لەوانەیە هەندێکتان چیرۆکی کرم و پەپولە بزانن. ئەم چیرۆکە باسی گۆڕان و قبوڵنەکردنی گۆڕان دەکات، واتە هەرچەندە کرمەکە بووە بە پەپولە بەڵام هێشتا نایەوێت قبوڵی بکات.

ڕۆژێک لە ڕۆژان کرمێکی بچووک دێتە دنیاوە. دوای هەوڵێکی زۆر لە شوێنێکەوە دەڕوات بۆ شوێنێکیتر. ئەم کرمە هەم لە کرمبوونی خۆی ڕازییە و هەم لە ژیانیشی، ڕۆژێک بڕیار دەدات بڕواتە سەر دارێک، چونکە بێزار بووە و ماندوو بووە لە خۆخشاندن. بەڵام ئەو دارەی بەتەمایە بەسەریدا سەربکەوێت دارێکی ئاسایی نییە، قەدێکی ئەستوور و گەڵای سەوزی جوانی هەیە. هەروەها چەندین ساڵە لە ژێر ئەم دارەدا یاری دەکات و پشوو دەدات. دەست دەکات بە سەرکەوتن بەسەر دارەکەدا.

کرمەکە بەسەر دارەکەدا هەڵدەگەڕێت، بەڵام دوای کەمێک دەخلیسکێت و دەکەوێتە خوارەوە و ناگات بەو شوێنەی دەیەوێت. بەڵام کۆڵنادات و بەردەوامدەبێت لە هەوڵدان. وردە وردە بەسەر دارەکەدا هەڵدەگەڕێت و لە کۆتاییدا سەرکەوتوو دەبێت. دواتر دەچێتە سەر لقێکی دارەکە کە هەموو دۆڵەکەی لێوە دیارە. کاتێک لەوێوە سەیر دەکات دیمەنێکی بێ وێنەی هەیە. ئاژەڵەکان، سەمای هەورەکان لە ئاسماندا و سەمای دەریا لەگەڵ شەپۆلەکانیدا دەبینێت. هەناسەیەکی ئارام هەڵدەمژێت. لە شوێنی خۆیەوە سەیری دەوروبەری دەکات. وابیردەکاتەوە کە ژیان زۆر جوانە و لە خۆیەوە ناگۆڕێت. لەم کاتەدا کرمەکە زۆر

ماندوبووبوو و هەرچەندە زۆر لە ژیانی ڕازیبوو بەڵام هەستی دەکرد کاتی ڕوودانی شتێک هاتووە.

کرمەکە لە ناکاو هەست بە ماندوێتی دەکات و بەدەم بیرکردنەوە لەوەی ژیانی زۆر زیاترە لە کرمێکی خشۆک خەوی لێ دەکەوێت. قۆزاخەیەک بە چواردەوریدا درووست دەکات. ئەمە توێکڵێکە کە دەتوانێت بۆ ماوەیەکی درێژ بیپارێزێت تا بتوانێت لەوێدا بگۆڕێت بۆ درووستکراوێکیتر. کە چاوی دەکاتەوە هەست دەکات لە ناو توێکڵەکەیدا گیریخواردووە و شوێنەکەی هێندە تەسکە ناتوانێت جوڵە بکات. هەست بە چەند شتێکی سەیر دەکات لەسەر پشتی. دوای کەمێک هەوڵدان باڵە شینەکانی دەجوڵێنێت و قۆزاخەکەی دەشکێت.

کرمەکە چتر کرم نییە، بەڵکو پەپولەیەکی باڵ شینی جوانە. بەڵام کێشەیەک هەیە. لەبەر ئەوەی ئەم کرمە هەتا ئێستا وەک کرم ژیاوە، هێشتا تێنەگەیشتووە کە ئیتر کرم نییە. پەپولە شینەکە هێندە سەریلێتێکچووە کە هەرچەندە باڵی هەیە بەڵام هێشتا قاچە بچووکەکانی بەکاردەهێنێت بۆ ڕۆیشتن. وا هەستدەکات خەریکە پاندەبێتەوە لە ژێر قورسایی باڵە شینەکانیدا. ئەمە قورساییەکی بێزارکەربوو بۆ ئەو. پەپولە شینەکە هەروەک پێشتر قاچەکانی بەکاردەهێنێت بۆ ڕۆیشتن. لەبەر ئەوەی هێشتا باوەڕی وایە کە کرمێکە هەر وەک کرم دەژی.

**"بەرەنگاری چی ببیتەوە، ئەو شتە هەر بەردەوام دەبێت."**

کارڵ ج. جەنگ

ئەو بەرەنگاربوونەوەیەی کرمەکە بوو بە پەپولە، بووە هۆی بەردەوامبوونی سەختییەکانی، دۆخە دەروونییە ناخۆشەکەی و بینینی خۆی وەک کەسێکیتر. بەڵام باڵەکانی ڕێگەیان پێنەدەدا هێندەی پێشتر بە خێرایی بڕوات.

**"ئەوەی کرم پێی دەڵێت کۆتایی من،**

**دوایی پێی دەڵێت پەپولە."**

**لاو تزو**

ئەو پەپولەیەی هێشتا وادەزانێت کرمە و وەک کرم دەژی نازانێت بۆچی ژیانی هێندە سەخت بووە. هەم بێزار بووە لە قورسایی باڵەکانی، هەم ماندوو بووە. بڕیار دەدات بگەڕێتەوە بۆ سەر ئەو لقەی لەسەری بووبوو بە پەپولە. ئەم جارە هەڵگەڕان بەسەر دارەکەدا هێندە سەختبوو بۆی کە دەکرێت بڵێین مەحاڵبوو. بایەک و شتێکی نەزانراو ئەوی هەر بەرەو دواوە پاڵدەنا. پەپولەکەی هێشتا بە کرم دەزانێت دەوەستێت و سەیری ئەو لقە دەکات کە بە زۆر دووری دەزانێت. دواتر بێ ئومێدانە دەست بە گریان دەکات... لەو کاتەدا پەپولەیەکی سپی جوان دەیبینێت و دێت بۆلای. پەپولە سپییەکە ماوەیەک بەبێدەنگی لەلای دادەنیشێت و سەیری پەپولە شینەکە دەکات. پەپولە شینەکە کە گریانەکەی دەوەستێتەوە پەپولە سپییەکە پێیدەڵێت:

"چی بووە؟"

"نەمتوانی بەسەر ئەو لقەدا هەڵبگەڕێم. پێشتر هەرچەندە زۆر سەختبوو بەڵام هەر دەمتوانی بیکەم."

"لەوانەیە نەتوانیت بەسەر ئەو لقەدا هەڵبگەڕێیت، بەڵام دەتوانیت بفڕیت بۆ سەری."

بەڵام پەپولە شینەکەی ئێمە چونکە هێشتا خۆی بە کرم دەزانێت سەیری لە قسەکانی پەپولە سپییەکە دێت. دواتر سەیرێکی باڵە شینەکانی خۆی دەکات. هەر وەک ئەو ڕۆژەی لە قۆزاخەکەی هاتە دەر، بە هێواشی دەیانجوڵێنێت و دەیانکاتەوە. باڵەکانی زۆر گەورە و جوانن. باڵەکانی شینێکی هێندە تێر و جوانن، کرمەکە لە ناکاو لە باڵەکانی دەترسێت و خێرا دایاندەخاتەوە.

پەپولە سپییەکە لە جێی خۆی هەڵدەستێت و بە پەپولە شینەکە دەڵێت: "بەداخەوە لەبەر ئەوەی باڵەکانت بەکارنەهێناوە قاچەکانت زۆر ماندووبوون." دواتر باڵەکانی خۆی دەکاتەوە و دەفڕێت. پەپولە شینەکە بە سەرسوڕمانەوە سەیری هەموو جوڵەکانی پەپولە سپییەکە دەکات و بە جوانی بیر لە قسەکانی دەکاتەوە. ئەو کاتە تێدەگات کە چیتر کرم نییە و دەکرێت ئەم باڵانە سوودی هەبێت بۆی.

پەپولە شینەکە باڵەکانی دەکاتەوە و ئەم جارەیان دایناخاتەوە. چاوەکانی دادەخات و هەست بەو بایە دەکات کە بەر باڵەکانی دەکەوێت. تێدەگات ئیتر کرم نییە و ناتوانێت وەک خشۆکێک بەردەوامبێت لە ژیان. هەرچەندە فڕین تەکنیکێکی زۆر ئاڵۆزی هەیە، بەڵام هێشتا ئاسانترە لەوەی قاچەکانی بەکاربهێنێت. بۆی

دەردەکەوێت کە ترسی لە فڕین ڕێگربووە لەوەی بزانێت کێیە و چیتر کرم نییە، بەڵکو بووە بە پەپولەیەکی شینی جوان. پاڵەوانی ئەم چیرۆکی گۆڕانە ئێستا خاوەنی باڵی گەورە، جوان و شینە. باڵەکانی بە چەندین تۆنی شین هەر لە شینی کاڵی ئاسمانەوە تا شینی تێری قوڵایی دەریاکان نەخشێنراوە.

'بیلال چیڤێلیک' چەند وان گوتویەتی:

**"ئەوانەی ئیرەیی بە فڕینی پەپولە دەبەن،**

**ئەو ئازارە پشتگوێ دەخەن کە لە ناو قۆزاخەکەیدا بینویەتی.**

**ئەو ئازارەی چەشتوویەتی ئەو جوانیەی بە پەپولە بەخشیوە."**

ئەو وانەیەی دەبێت لەم چیرۆکەوە فێری ببین بریتییە لەوەی؛ دەبێت گۆڕانەکان قبوڵ بکەین. نابێت لە ڕابردووماندا بمێنینەوە. لە دونیایەکدا دەژین کە بەردەوام دەگۆڕێت، بەرەوپێش دەچێت و خۆی نوێ دەکاتەوە. هەندێک جار گۆڕان خۆی دێت و لە دەرگامان دەدات. هەرچەندە خۆمان بە بەهێز بزانین بەڵام هەر قبوڵی ناکەین و دەرگای لێ ناکەینەوە. چونکە دەترسین لە گۆڕان و لەوەی چیتر وەک پێشتر نەبین. ئەمەش ترسێکی بێمانایە. دەمەوێت ئەم ڕستەیەی 'ئێرۆی مۆرێنۆ'تان بهێنمەوەیە یاد لەمبارەیەوە:



**ژیان هێندە ماندووت دەکات کە ئیتر هەست بە قاچەکانت ناکەیت، بەڵام هەر کۆڵمەدە، واز مەهێنە. باڵەکانت بکەرەوە و بفڕە، مەترسە.**

## بەخێرهاتیتەوە بۆلای خۆت

مرۆڤ دوای ئەوەی ئەم هەمووەی بەسەردا هات، تەنها پەنا دەبات بۆ یەک شوێن و دەڕوات بۆ ئەوێ و لەوە بەدواوە هێندە بە ئاسانی ئەوێ بەجێناهێڵێت؛ ئەویش لای خۆیەتی... ئەم هەموو ماوەیە بەدوای کەسە ڕاستەکە و خۆشەویستی ڕاستەقینەدا گەڕایت. هەر کەسێک هاتە بەردەمت وەک خۆت خۆشتویست. هێندە بە جوانی ڕۆڵیان دەبینی کە باوەڕت پێکردن. هەر جارێک کە گوتت؛ "ئەمەیان جیاوازە" بە هەڵەدا چوویت. ئاسوودەیی ویژدان زۆر بە چێژە بۆ مرۆڤ... تۆش چێژەت تامکردووە.

چونکە تۆ ئەوەی لەسەرتبوو کردت و ویژدانت ئاسوودەیە. دوای ماوەیەک کە سەیرت کرد ئەو ڕێگایەی پیایدا دەڕۆیت سەری گیراوە، لە بەرامبەر هەموو ئەو فیداکارییانەی دەیکەیت بێ وەفاییت بەرامبەر دەکرێت، ئەو هەموو بەهایە نابینن کە پێیان دەدەیت، هەموو ئەو خۆشەویستییەی پێشکەشیان دەکەیت فڕێی دەدەنە سەبەتەی زبڵەوە، ئەو دڵەی پێت بەخشیون دەیشکێنن، ئیتر تۆش پەنات بردەوە بۆ خۆت.

وەرە بۆخۆت دانیشە، کەمێک بشوو بدە. زۆر خۆتت ماندوو کرد بۆ هەندێک کەس و ڕووداو کە هیچیش شایەنی

ئەوە نەبوون. بەشی پێویست ماندووبوویت ئیتر نابێت خۆت بۆ ئەو کەسانە ماندوو بکەیت کە نە دەزانن چیاندەوێت و نە دەزانن هەست بە چی دەکەن. چەنێکە هەر دەیدۆڕێنیت چونکە لە هەموو شتێکدا دڵت بە تەواوەتی خستە دەستی ئەوانەوە، بەڵام لە کۆتاییدا خۆتت بردەوە. ئیتر بە تەنها هەوڵ بۆ خۆت بدە.

**ئێستا کاتی پشوودانە.**

**کاتی ناسینی خۆتە.**

**بەخێرهاتیتەوە بۆلای خۆت، باشبوو کە هاتیت.**

**"گوڵ پێشکەشی خۆشەویستەکانتان بکەن، ئەگەر گوڵتان پێ نەبوو زەردەخەنەیەکی پێبدەن."**

مەولانا

دەکرێت ماوە ماوە ژیانمان سەخت بێت و پڕ ستریس بێت. لەم کاتانەدا مرۆڤ ئارەزووی شوێنێک دەکات کە بتوانێت ڕابکات بۆی و لەگەڵ خۆیا بە ئارامیی بمێنێتەوە. ژیان، کار، عەشق، خێزان و هاوڕێ، هەروەک چۆن خۆشی بۆ مرۆڤ دەهێنن دەکرێت جارجار خەمباریشی بکەن. تەنها لەبەر ئەوەی خۆشتدەوێت ناچار نیت بەرگەی نەرێنی کەس بگریت و ئەوانە قبوڵ بکەیت کە بەرامبەرت دەکرێت. واز لە هەموو ئەوانە بێنە کە وا دەزانن ناتوانیت وازیان لێبهێنیت، کێ نییەتی باشت بە خراپی بەکاردەهێنێت لە ژیانت دەری بکە. ڕێگە بە کەس مەدە ئاسوودەبێت و بڵێت؛ "هەرچییەک ببێت منی هەر خۆشدەوێت." بە دڵی خۆی شت بکات بێ ئەوەی بۆ ساتێکیش بیر لە ئەنجامەکەی بکاتەوە. ئەو کەسانە لە ژیانتا مەهێڵەرەوە کە هەموو وزەت هەڵدەمژن و پڕت دەکەن لە وزە خراپەکانی خۆیان.

با بیر لە تەلەفۆنەکەت بکەینەوە. چەند بەرنامەیەکی تێدایە

کە جگە لە وزە خواردن هیچ کاریکیتر ناکەن، بەڵام ڕۆژێک داتبەزاندووە و نەتسرپیونەتەوە. هەندێک کەسیش وەک ئەو بەرنامە بێسودانەی ناو تەلەفۆنەکەتن، وەک ئەوەی بەس نەبێت کە هیچ سودێکیان نییە، بەڵکو زیانیشت پێ دەگەیەنن و هەموو وزەت هەڵدەمژن. دەبێت ئەم بەرنامەیە لە تەلەفۆنەکەتدا بسڕیتەوە، ئەو کەسانەش لە ژیانتدا بسڕیتەوە کە تەنها وزەت کەمدەکەنەوە.

**سەیرکە 'تۆماس سترینس ئیلیۆت' چەند جوان ئەم دۆخەی کورت کردوەتەوە:**

**کاریگەری کەسە نەرێنییەکان،**

**وەک کاریگەری تیشکدانە.**

**دەتوانیت بەرگەی بڕێکی کەم بگریت بۆ ماوەیەکی کەم،**

**بەڵام ئەگەر بەردەوام لە ژێر کاریگەرییەکەیدا بمێنیتەوە دەتکوژێت."**

## ئەم ژیانە هی تۆیە.

ئامۆژگارییەکی سەباح الدین علی:
"هەرچییەک دەڵێن با بیڵێن،
ئێمە دەبێت ئەو شتانە بکەین کە دڵمان و مێشکمان
بەڕاستی دەزانن، بێ گوێدانە قسەی دەورووبەرمان."

ڕەخنەت لێ دەگرن، بە هەڵە لێتتێدەگەن، لە پشتەوە باست دەکەن، بەڵام بیرکردنەوەی ئەوان نابێت بە کێشە بۆت. بیروڕای هیچ کامیان ناتوانێت تۆ بڕوخێنێت. سەرەڕای هەموو شتێک و بەرامبەر هەموو کەسێک لەسەر پێی خۆت دەمێنێتەوە و پڕ بە دڵ ژیانی خۆت دەژیت.

لەبیری مەکە، ئەو شتانەی دەگوترێت هیچ لە بەهای تۆ و ئەو شتانە کەم ناکاتەوە کە تۆیان درووستکردووە. ناتوانن هیچ شتێکیش بگۆڕن. ئەوان هەر قسە دەکەن و ئەمەش ئەستێرەی تۆ گەشاوەتر دەکات. بە بیرکردنەوە لەوەی ئەم چی دەڵێ و ئەو چی دەڵێ ژیانی خۆت بەهەدەر مەدە. شەرم لە کەس مەکە. خەڵکی کە شتێک دەکەن یان کە بڕیارێک دەدەن دێن و پرس بە تۆ دەکەن؟ ڕاوێژت پێ دەکەن؟ نەخێر. تۆش پرس و ڕاوێژیان پێ مەکە. هەڵە دەکەیت؟ بیکە. مەترسە لەوەی قسە بکەن، ئەگەر

تۆ هیچیش نەکەیت ئەوان هەر قسە دەکەن. ئەمە ژیانی تۆیە... ڕێگایەکی درێژت لە پێشە. ئەم ڕێگایە لە خۆت مەکە بە زەهر تەنها لەبەر ئەوەی ئەوان قسە دەکەن. ڕۆیشتن بە ڕێگەی کەسێکیتردا ونکردنی ڕێگەی خۆتە. بۆیە ڕێگەی خۆت ونمەکە. هیوادارم بەرد نەیەتە سەر ڕێگەت. دڵت چاوی بە کەسانی باش بکەوێت.





**گوێ لەم ڕستەیەی 'بێرنارد شۆ' بگرە:**

**"هەرچۆنێک بێت ئەوان هەر باوەڕ بەوە دەکەن**

**کە دەیانەوێت.**

**بۆیە خۆتبە."**

## ئەوەی چاوەڕێی زۆر شت بکات
## ئازاری زۆریش دەچێژێت

بۆم دەرکەوت کە ئیتر چاوەڕێی هیچ لە هیچ کەس و شتێک ناکەم کەمتر خەم دەخۆم. پێشتر گرنگیم بە هەموو شتێک دەدا و بە ووردی بیرم لە هەموو شتێک دەکردەوە، لەبەر خاتری کەسانی کەلە ڕەق خۆمم خەمباردەکرد. بەڵام ئیتر ئەو منە کۆنە نەماوە و سڕیومەتەوە. من بۆ ئەوە نەهاتوومەتە ناو ئەم ژیانەوە تا هەر بەدوای کەسانێکدا ڕابکەم کە دەڕۆن بێ ئەوەی سەیری دواوەشیان بکەن و فیداکاری بۆ کەسانی بێ وەفا بکەم. بینیم کە چاوەڕوانیی جگە لە خەمبارکردن، ماندوو کردن و شەکەتکردنی مرۆڤ بە کەڵکی هیچ شتێکی تر نایەت، بۆیە بڕیارمدا لەمەودوا چاوەڕێی هیچ شتێک نەکەم لە بەرامبەر هیچ شتێک. با خۆشەویستی و نزیکییە ساختەکانتان و ڕۆڵەکانتان بۆ ئێوە بن. واز لە من بهێنن، من لەگەڵ خۆمدا باشم. وە دواتر ئەم قسانەی شکسپیرم هێنایەوە یادی خۆم:

"دەزانیت من هەمیشە دڵخۆشم؟ چونکە چاوەڕێی هیچ

لە کەس ناکەم. چاوەڕێکردنی بەرامبەر هەمیشە زیانت پێ دەگەیەنێت. ژیان کورتە، بۆیە ژیانت خۆشبوێت و دڵخۆشبە. نەکەی واز لە پێکەنین بهێنیت. بۆ خۆت بژی و پێش ئەوەی قسە بکەیت گوێ بگرە. پێش ئەوەی بنووسیت بیر بکەرەوە، پێش ئەوەی خەرجی بکەیت بەدەستی بهێنە. پێش ئەوەی ڕقت لێیبێت خۆشتبوێ، پێش ئەوەی بمریت بژی."

**هەروەک 'ڕۆبین شارما' دەڵێت؛**
**"مرۆڤ هێندەی چاوەڕوانییەکانی دڵخۆشە.**
**هاوکێشە: چاوەڕوانی سفرە، دڵخۆشی بێکۆتایە..."**

## ناتوانی هانا بۆ ئەو کەسانە ببەیت
## کە ناحەقیت بەرامبەر کردوون

تۆ وا دەزانیت من هەموو شتێک قبوڵ دەکەم؟ وا دەزانیت هەموو ئەو هەڵسوکەوتانەت لەیاد دەکەم کە ئازارم دەدەن و وەک هەموو کاتێک بەڕووتدا پێدەکەنم؟ ڕاستە من زیاد لە پێویست بەهام پێدایت، بۆیە وادەزانیت لێت خۆشدەبم. نازانیت چۆن کۆتاییت بە ئێمە هێنا، بەو هەڵسوکەوتە ساردانەت، درۆ ئازاردەرانەکەت، خۆ بەزلزانییەکەت و خۆ پەرستییەکەت. ئەگەر دوو چاوی بە فرمێسک و دڵێکی شکاوت لە دوای خۆت بەجێهێشتبێت ئەوا نە دەتوانیت جارێکیتر پێبکەنیت نە دەتوانیت کەست خۆشبوێت. ئەگەر ڕۆژێک پەشیمانبوویتەوە و گەڕایتەوە، هەرگیز ئەمە لە بیر مەکە:

ناتوانی هانا بۆ ئەو کەسانە ببەیت کە ناحەقیت بەرامبەر کردوون.

## "ناحەقی بەرامبەر هەر کەسێک بکەیت هەر دێتەوە ڕێت."

**مەوداکان ڕێگر نین لەبەردەم خۆشەویستیدا،**
**"مرۆڤ ئەگەر لە دڵەوە کەسێکی خۆشبوێت،**
**ئەوا بەردەکانی سەر ئەو ڕێگایەشی خۆشدەوێت کە بەرەو خۆشەویستەکەی دەڕوات."**

هیچ مەودایەکم نەبینیوە و، نەبیستوە و نەزانیوە کە لە مەودای دڵی مرۆڤ دوورتر بێت. ئەوەی پێی دەڵێن مەودا دڵی مرۆڤ خۆیەتی و ئەمە زۆر بەباشی دەزانم. ئێستاش دەمەوێت باسی چیرۆکێکت بۆ بکەم کە بەسەر خۆمدا هاتووە؛

دوو سێ ساڵ پێش ئێستا ژنێکم ناسی، دەستمانکرد بە قسەکردن، بەڵام خۆشی دەیزانی کە بەردەوامیبوونی قسەکردنمان هەمووی کەوتبووەوە سەر من. چونکە هەمیشە کاتێک ئەو دەیویست هەموو شتێک تێکبدات و بڕوات من هەموو شتێکم چاکدەکردەوە. هەر هەوڵم دەدا ئێمە بەیەکەوە ببەستمەوە، بەڵام هەر سەری نەدەگرت. ئەو کەسێکی هەستیار نەبوو. لە سەرەتادا

بە منی گوتبوو کە کەسێکی هەستیارە، بەڵام هیچ وا نەبوو. هەر کاتێک هەنگاوم بەرەو ئەو بنایە سوژنێکی بەدەستەوە گرتبوو و ئامادەبوو تا پیامدا بکات. هێندە خۆشمدەویست ئیتر ڕاهاتبووم لەگەڵ ئازاری سوژنەکەشدا. یەک دوو ساڵ لە من بچووکتربوو، بەڵام ئەمە بە واتای ئەوە نایەت کە ناتوانین یەکتریمان خۆشبوێت و لە یەکتر تێبگەین. چونکە تەمەن تەنها ژمارەیەکە و هەرگیز لە ڕووداوەکان و ئەزموونەکان گرنگتر نییە.

چۆن کاتێک کە ماسییەک لە ئاو دەردەهێنیت دەکەوێتە پەلەقاژەکردن بۆ گەڕانەوە بۆ ناو ئاوەکەی، منیش ئاوا پەلەقاژەم دەکرد تا ئەو بمبینێت. هەرچییەکم کرد نەمتوانی تێیبگەیەنم کە مەوداکان ڕێگر نین لەبەردەم خۆشەویستیمان و پەیوەستبوونمان بەیەکەوە. هەتا کۆتا ئاست هەوڵم لەگەڵدادا. زۆر هەوڵمدا تا سەربگرێت، بەڵام سەرینەگرت. بیرۆکەی "مەودا ڕێگرە لەبەردەم هەموو شتێکدا" چووبووە مێشکییەوە و هەرگیز نەمتوانی ئەم بیرۆکەیە لە مێشکی دەربهێنم. نەمتوانی و سەرکەوتوو نەبووم. دەزانم ئێستا دەڵێن بۆچی نەچوویت بۆلای؟ و دەزانن نەچووم؟ ڕۆیشم. هەموو بلیتەکانم بۆلای ئەو بوو بە ئومێدی ئەوەی منی خۆشبوێت... ئەو کاتە من لە ئیستانبوڵ دەژیام و ئەویش لە ئەنتاڵیا. لەبەر خاتری ئەو چووم بۆ ئەنتاڵیا، تا ئەو ببینم. تا بۆ یەک جاریش بێت باوەشی پیادا بکەم. سییەکانم پڕ بکەم لە بۆنی ئەو. دەنگی لە ناو گوێچکەکانمدا زیندانی بکەم.

پێی گوتم کە نایەوێت من خەمبار بکات و وازی لە قسەکردن هێنا لەگەڵم، وەک ئەوەی ئەمە خەمبارم نەکات. توڕەبووم لە خۆم، چونکە دوای کەسێک کەوتبووم کە هەرچەندە هەرگیز منی خۆشنەویستووە، من چووم بۆلای تا بۆ یەک جاریش بێت بیبینم، بەڵام ئەو هەر نەشهات بۆلام.

بە ئومێدی ئەوەی دەستەکانی بگرم هاتبووم بۆ ئەم شارە و ئێستەش بە دەست بەتاڵی دەگەڕێمەوە. نە دەستی بەر دەستم کەوت نە دڵی بەر دڵم کەوت. هەر نەشهات بۆلام. بەڵام دەبوو من بێم. نەدەکرا هەر لە جێی خۆم دابنیشم و بڵێم ئەوەم دەوێت. دڵم وەک ئەو منداڵەبوو کە دایکی لێیدەدات و کە دەشگری هەر دەڵێت دایە و نەیدەتوانی واز لەو خووەی بهێنێت.

بەهەرحاڵ، پێش ئەوەی دەستپێبکات تەواو بوو. وازمان لە قسەکردنیش هێنا. بەردەوامبووین لە ژیان وەک ئەوەی هیچ نەچووبێتینە ژیانی یەکترەوە و هیچ یەکمان نەناسیبێت. دواتر من ماڵم لە ئیستانبوڵ-ەوە گواستەوە بۆ ئەنتاڵیا. ئەوە دوو ساڵ زیاترە لێرەم. نە پەیوەندیم بەوەوە کرد و نە نامەم بۆ نارد. چونکە ئەو کەسەی کاتێک دووربووم لێی گرنگی پێنەدام و نەیبینیم ئێستا بەهاشم پێبدات و گرنگیشم پێ بدات هیچ گرنگ نییە لەلام. بۆیە هەرگیز پەیوەندیم پێوە نەکرد.

کاتێک بە شێوەیەکی ئاسایی بەردەوامبووم لە ژیانی خۆم، دووبارە هاتەوە سەر ڕێگام. بڕیارماندا چاومان بە یەکتر بکەوێتەوە و قسە بکەین. کاری تەواوبووبوو، چووبوو بۆ

کافتریایەک و لەوێ چاوەڕێی منی دەکرد. کاتێک دەچووم بۆلای هیچ گۆڕانکارییەک لە لێدانی دڵمدا ڕوویندەدا. پێڵووی چاوەکان وەک هەمیشە لە هەمان کاتدا دادەخران و دەکرانەوە، دەستەکانم ئارەقیان نەدەکردەوە و هیچ نیشانەیەکی دڵەڕاوکێم پێوە دیار نەبوو. بەبێ هەست، دڵشکاو و بەتاڵ چووم بۆلای.

هەستم بە تۆزقاڵێکی ئەو هەستانەش نەکرد کە کاتێک لە ئیستانبوڵ-ەوە هاتم بۆلای ئەو هەمبوو. کەمێکیش دڵم لێی شکابوو. بەڵام ئەمە هیچ گرنگییەکی نەبوو. بەهەرحاڵ، کە لە دوورەوە ئەوم بینی هەستم بە هیچ شتێک نەکرد. ئارەزووم دەکرد وا نەبم بەڵام وابووم. نازانم بۆچی بەڵام لەو ساتەدا هەموو گۆرانییە خەمناکەکان لە گوێمدا دەزرنگانەوە و هیچ هەستێکیشیان لە ناخی مندا نەدەجوڵاند. لەسەر مێزەکەی دانیشتم. وادیاربوو پەشیمانە و بۆ ماوەیەکی درێژ سەیری منی کرد.

گارسۆنێک هات بۆلام و پرسی چی دەخۆینەوە. داوای قاوەیەکی سادەم کرد بۆ خۆم. ئەو هیچی داوا نەکرد. چونکە کاتێک چاوەڕێی منی کردووە قاوەکەی خۆی خواردبوەوە. لە ڕاستیدا هێندەم پێنەچوو. دەیتوانی چاوەڕێم بکات تا بەیەکەوە قاوە بخۆینەوە. ئەو کاتە بە خۆمم گوت تەنانەت بۆ قاوە خواردنەوەیەکیش چاوەڕێی تۆ ناکات. تۆش چاوەڕێی خۆشەویستی لەم کەسە دەکەیت؟ ئێستا دەڵێن هەر قاوەیەکە قەیچێکە، کچە داماوە ناکرێت کاتێک چاوەڕێت دەکات قاوەیەکیش

بخواتەوە؟ بەڵام ئەمانە لەلای من گرنگن. بۆنموونە کاتێک چاوەڕێی کەسێک دەکەم، هەتا ئەو کەسە نەیەت نە هیچ دەخۆم نە هیچ دەخۆمەوە. چونکە ئەو شتانەش کە لەگەڵ ئەو کەسەدا دەیخۆم و دەیخۆمەوە دەبنە یادەوەرییەک بۆ من. لەوانەیە ئەمانە زۆر گرنگ نەبن بۆ ئێوە، لەوانەشە بڵێن؛ "زۆر بە وردی بیری لێ دەکەیتەوە میراچ، ژیان ئاوا چۆن دەڕوات؟" بەڵام هەرچەندە بۆ ئێوە گرنگ نەبێت بۆ من زۆر گرنگن. هەر واش دەمێننەوە.

قومێکم لە قاوەکەمدا و دەستمان کرد بە قسەکردن. ئەو باسی هەندێک شتی کرد و من گوێم لێیگرت. منیش باسی هەندێک شتم کرد و ئەو گوێی لێگرتم. باسی کۆتا کەسی کرد کە هاتۆتە ناو ژیانییەوە و گوتی ئەویش ناوی میراچ بووە. ڕێک لە جێی خۆم وشکبووم. دوای کەمێک هاتمەوە سەر خۆم و بەردەوامبووم لە گوێگرتن لێی. لە ڕاستیدا هەرگیز لە ڕابردووی کەس ناکۆڵمەوە و لێی وردنابمەوە، بەڵام ئەم بابەتە سەرنجمی ڕاکێشا. هەتا توانیم بابەتەکەم درێژکردەوە و هەموو پرسیارم لەسەر هەموو ئەو شتانە لێ کرد کە دەمویست بیزانم. گوتی کە خۆشەویستە کۆنەکەشی بورجی کەوان بووە، ناوی میراچ بووە، لە هەمان تەمەنی مندابووە و ئەویش لە ئەنتالیا ژیاوە. بەڵام جیابوونەتەوە.

ئێستا داواتان لێ دەکەم خۆتان بخەنە شوێنی من. کەمێک بە بێدەنگی بیر بکەنەوە؛ کەسێک هەیە دەتەوێت بتخاتە ژیانییەوە، تۆی خۆشبوێت و شوێنێکی جوانت بۆ بکاتەوە لە ژیانیدا.

ئەویش خۆی لە پشتی بەهانەی دووری و مەوداوە دەشارێتەوە و پێت دەڵێت کە پەیوەندییەکی دووری ناوێت. سەرەڕای ئەمەش هەڵدەستیت و دەچیت بۆ ئەو شارەی ئەوی لێ دەژی تا بیبینیت و ڕووبەڕوو قسەی لەگەڵدا بکەیت. ئەو هەر عەزێتیش ناکێشێت بێت بۆلات و چۆن هاتوویت ئاوا دەگەڕێیتەوە. دواتریش دەیبیستیت کە خۆشەویستە کۆنەکەشی هەمان ناو و هەمان تایبەتمەندی تۆی هەبووە و لە هەمووشی گرنگتر سەرەڕای ئەوەی تۆ هەرچیت لەدەست هاتووە بۆت کردووە و ئەو کەسەی هاتۆتە ژیانییەوە هەمان ناوی تۆی هەیە، بەڵام بۆ ساتێکیش تۆی بیرنەکەوتۆتەوە. واتە بە کورتییەکەی هەبوونی منی هەر پشتگوێ خستبوو و کەسێکیتری خستبووە جێگەم و سەرەڕای ئەوەی ئەو کەسەش هەمان ناوی منی هەبووە، بەڵام هەر منی بیرنەکەوتۆتەوە و منیش چاوەڕێم ئەم کەسە منی خۆشبوێت و بەهام پێبدات. لە ئەنجامدا؟ وازم لێهێنا.

لەوانەیە منی خۆشنەوێت. لەوانەیە نەیەوێت من بخاتە ژیانییەوە. لەوانەیە منی بەدڵ نەبێت. دەتوانم ڕێز لەمانە بگرم و قبوڵیان بکەم. نە دەتوانم بە زۆر وابکەم کەسێک خۆشیبوێم و نە دەتوانم بە زۆر وابکەم بمخاتە ژیانییەوە. هێندە بێچاووڕوو نیم. بەڵام ناتوانم قبوڵی بکەم خۆی لە پشت کۆمەڵێک بەهانەی بێ ماناوە بشارێتەوە کە هەرگیز ڕێگر نین لە بەردەم خۆشەویستی و پەیوەستبوونی دوو کەسدا و دیوارێکم لەبەردەمدا هەڵبچنێت و من فڕێ بداتە بەردەم دیوارێک و خۆی لە پشتی دیوارەکەوە

گوڵ بۆ خەڵکیتر دەربکات. من ناتوانم ڕێز لەمە بگرم و قبوڵی بکەم.

دەمـەوێت بڵێم: مـەودا تەنها ژمـارەیـەکە. یـەک بلیت و یەک گەشتە. بەڵام هەموو کەسێکیش ناتوانێت خۆشەویستی دوورمـەودا بکات. ئەگەر کەسێک لەبەردەم چاوتدا بێت یان چەندین کیلۆمەتریش لێتەوە دووربێت هیچ جیاوازییەکی نییە. کە سەری نەگرت ئیتر سەر ناگرێت با لەبەردمیشتدا بێت. ئەم چیرۆکەش جوانترین بەڵگەیە لەسەر ئەمە؛ ئەو کەسەی منی خۆشنەویست تەنها لەبەر ئـەوەی دوورم لێی، دواتـر کە لێی نزیک بوومەوە جێیکردمەوە لە ژیانیدا و دووبارە ڕێکنەکەوتین بەیەکەوە و جیابووینەوە. ئـەم چیرۆکە پێشکەشە بەوانەی وادەزانن مەودا ڕێگرە لەبەردەم خۆشەویستی و پەیوەندییەکی ڕاستەقینە.

**ئەوەی خودای خۆشدەوێت بێ ئەوەی بیبینێت،**
**چ کاری بە مەودا هەیە؟**

# ئەم ماندوێتییە تەواو نابێت

هەتا ئێستا کێ پێویستی بە هەرچییەک بووبێت رامانکرد بۆ یارمەتیدانی. کێ پێویستی بەوە بووبێت کە لەلای بین بە چاوتروکاندنێک گەیشتینە لای. یەک جاریش بێت خراپەمان بەرامبەر کەس نەکردووە. پشتمان لە کەس نەکرد. بە کەسمان نەگوت نەخێر، نابێت. چیمان لەدەستهاتبێت کردوومانە. کەس لە لەدەستدانی ئێمە نەترسا، تەنها ئێمە لە لەدەستدانی ئەوان ترساین.

گرنگیمان بەو کەسانەدا کە هیچ گرنگ نەبووین لەلایان. دوای ماوەیەک بۆمان دەرکەوت کە تەنها خۆمان ماندوو کردووە. دواتریش هەرچییەکمان کرد نەمانتوانی ئەم ماندوێتییەمان بڕەوێنینەوە. چونکە ئێمە کەسانێک نین خۆمان لە پشت بەهانەکانەوە بشارینەوە و هەر تەنها دەم و قسەبن و هیچ کردەوەیەکیان نەبێت. وانەبووین و هەرگیز وا نابین.

**سەیرکەن 'ڕەشاد نوری گونتێکین'**

**چۆن بە کورتی باسی ئەم ماندوێتییەی کردووە:**

**"ئێمە کەسانێکین ناتوانین بڵێین نەخێر،**

**کارم هەیە و ئێستا پێمناکرێت.**

**بۆیە ماندوێتی ئێمە هەر تەواو نابێت."**

**کاتێک هەڵەمان بەرامبەر دەکرێت،**
**لێی خۆشدەبین،**
**کاتێک خراپەمان بەرامبەر دەکرێت،**
**دەرگاکەی نیشان دەدەین.**

کاتێک بینیم چەند ئازاریانداوم و زەرەریان لێداوم بە ڕستەکانیان، ئیتر هەموو دەرگاکانی داوای لێبووردنم داخست. لە ژیانی مندا جێی داوای لێبووردن لەسەر خراپە نابێتەوە. هەموو مرۆڤێک هەڵە دەکات و ئەمە دەزانم. دەتوانم لە هەڵە خۆشببم بەڵام ملم کەچ ناکەم بۆ خراپەکاری. منیش هەڵە دەکەم. بەڵام کاتێک خراپەیەک بەرامبەر کەسێک دەکەم وەک هەڵە دەری ناخەم و چاوەڕێی لێخۆشبوونی لێ ناکەم. کاتێک دەبێت بڕۆم ئەوا دەڕۆم. هەرگیز ڕووی ئەوەم نەبووە خراپەیەک بکەم و داوای لێبووردن بکەم. هەموو کەس کە شتێک دەکات دەزانێت چی دەکات. زیانەکانی و ئەنجامەکانیشی دەزانێت. بۆیە با کەس هەوڵ نەدات ئاو لەو پەرداخەدا بخواتەوە کە بە ئەنقەست فڕێیداوەتە سەر زەوی کاتێک سوور دەیزانی دەشکێت.

**ئەم ڕستییە زۆر جوانە بەلامەوە:**
**"داوای لێبووردنکردن وەک ئەوە وایە گوڵێک لێبکەیتەوە و بیخەیتە ناو ئاوەوە، هێندە بێ مانا و بێ سوودە."**

## هەستەکانی تێکی دەدات و مەنتق چاکی دەکاتەوە

تەنهایی سۆزداری هەموو شتێک بە مرۆڤ دەکات. قۆناغێک هەیە لە ژیانی مرۆڤدا کە تێیدا دەکەوێتە دەستی هەستەکانییەوە و بۆ ماوەیەک ناتوانێت لەو بەتاڵییە بێتە دەرەوە. هەندێک کەسیش هەوڵدەدەن ئەو کەسانە بەکاربهێنن کە کەوتوونەتە ئەم دۆخەوە.

ئەوانەی لاوازترین خاڵی هەستەکانیان نیشانی خەڵکی دەدەن، لە هەموو کەس زیاتر بریندار دەبن. بە ئەزموون فێری ئەمەبووم، بە هەستەوە بەرەو کێ ڕۆیشتبێتم ئەنجامەکەی نەگۆڕاوە. دوای ماوەیەک فێربووم کە بە هەستەوە بەرەو مرۆڤەکان و ڕووداوەکان نەڕۆم. لەوەتەی توانیومە ئەمە بکەم کەمێک ئاسوودەتر و کەمتر خەم دەخۆم. من پێشتر دەمگوت هەرچییەک لەدەست بدەم با هەر بە هەستەکانمەوە لەدەستی بدەم و ئەگەر خەمیش بخۆم هەر واز لە هەستەکانم ناهێنم، بەڵام ئێستا بە مەنتق ژیانم بەڕێوە دەبەم. بیرمە ڕۆژانێک دەمگوت؛ "مەنتق؟ نەخێر هەرگیز." بەڵام دووبارە بۆم دەرکەوتەوە کە نابێت هەرگیز بڵێیت هەرگیز لەم ژیانەدا. بۆ نمونە هەموومان

دەزانین ژنان لە پیاوان هەستیارترن. بەڵام ئەگەر ژنێک بێتە سەر ڕێگەتان کە کار بە مەنتقی دەکات، ئەوا کارتان زۆرە.

وە بەڕای من ژن کاتێک بێبەزەیی دەبێت کە کار بە مەنتقی دەکات. ئەمەش لەبیر مەکە، کاتێک ژنێک دەستدەکات بە بەکارهێنانی مەنتقی ئەوا تۆ تیاچوویت.

**ئەم ڕستەیەی 'پابلۆ نێرودا'**
**چەند جوان باسی ئەم دۆخەی کردووە:**
**"ئەگەر ژنێک بێدەنگبوو کاتێک یەک دنیا شتیشی هەبوو بۆ گوتن،**
**ئەوا ئەو پیاوەی بەرامبەری هەموو چانسەکانی خۆی لەدەستداوە."**

## "لە ژیاندا یەک دنیا شت هەیە بۆ کردن، بۆیە هیچ پێویست ناکات سووربیت لەسەر ئەنجامدانی هەمان هەڵە"

جین پاول سارترێ

هەڵە دەبێتە ئازارێک، دڵ شکاوییەک و کەمێکیش پەشیمانی، بەڵام لە کۆتاییدا هەر دەبێتە ئەزموونێک بۆ مرۆڤ. دوای هەموو هەڵەیەک ئەزموونێکی نوێ بەدەست دەهێنیت. هەندێک خەڵکیش بەشێکن لەم هەڵەیە. چونکە هەر کاتێک کەسێکی نوێ دەهێنیتە ژیانتەوە فێری ئەزموونێک دەبیت. زۆربەی ئەو کەسانەی متمانەیان پێدەکەین و دەیانهێنینە ناو ژیانمانەوە دەبنە هەڵەیەکی هێندە جوان کە ئەو ئەزموونانەی لە سایەی ئەوانەوە بەدەستمانهێناوە دیواری زۆر بەرزتر و ئەستوورتر درووست دەکەین. دواتریش ئەو دیوارانە هەرگیز ناڕووخێن. ناتوانیت بیانڕوخێنیت. دەترسیت لەوەی دووبارە ئەو هەڵەیە بکەیتەوە. ئینجا بە چاوی هەڵەوە سەیری ئەو کەس و ووردەکارییانەش دەکەیت کە هەڵە نین. بۆ نمونە، متمانە بە کەسێک دەکەیت، متمانە بە قسەکانی دەکەیت، متمانە بە دڵی دەکەیت، متمانە بە ڕاستگۆیی دەکەیت. دواتر ئەو کەسە دێنیت و دەیخەیتە چەقی

ژیانتەوە. بە تێپەڕبوونی کات دەبینیت ئەمە هەڵەیە، بەڵام ئیتر دەمێکە کار لە کار ترازاوە. وە لە کۆتاییدا ئەزموونێکیتریش فێردەبیت. ئەزموونێکیتر... ئەزموونێکیتر...

دواتر بە گومانەوە سەیری هەموو ئەو شتانەش دەکەیت کە دەکرێت ببنە گەورەترین قازانجی تۆ. چونکە دەمێکە بەهۆی ئەو کەسانەی متمانەت پێکردوون و چانست پێداونەتەوە ئەو دیوارانەت هەڵچنیوە. لە ناکاو سەیردەکەیت ئەو دیوارانەی بۆ پاراستنی خۆت هەڵتچنیون بەسەرتدا ڕووخاون و تۆ لە ژێریاندا پانبوویتەتەوە. بۆیە هەوڵ لەگەڵ هیچ شتێکدا مەدە کە دەزانیت سەرناگرێت. بەو ڕێگایانەدا مەڕۆ کە کۆتاییەکەیان دەزانیت و بە خۆڕایی خۆت ماندوو مەکە. هەڵە تەنها یەک جار جوانە... دووبارە و دووبارە هەمان هەڵە مەکەرەوە. چونکە هەڵەی جوانتر هەیە بۆ کردن. ئەزموونی زیاتر هەیە بۆ فێربوون.

**سەیرکە 'یونس ئیمرێ' چەند جوان گوتویەتی:**

**"ئەو کەسەی هیچ هەڵەیەک ناکات، ئەوا کەسێکە کە هیچ شتێک ناکات،**

**وە گەورەترین هەڵەی ژیان ئەوەیە خۆت بە بێ هەڵە بزانیت."**

## من خۆمم خۆشدەوێت

ترسم لە شتێک هەیە کە پێی دەگوترێت تەنهایی. بەهۆی ئەو ترسانەمەوە دیواری ئەستوورم هەڵچنیوە و خۆمم لە پشتییەوە شاردۆتەوە. تەنها یەک کەس هۆکاری ئەمانە نیە. چەندین کەسن. ئەوانەی دەمناسین، ئەو کاتە متمانەم پێ دەکردن و خۆشمدەویستن. ناحەقی دەکەم ئەگەر هەمووی ببەستمەوە بە بابەتی خۆشەویستییەوە.

کاتێک ئەو کەسانەی متمانەم پێدەکردن و خۆشمدەویستن؛ بە پەشیمانی، بێ ئومێدی و یەک دنیا ئازارەوە وەڵامی نییەتە باشەکانمیان دایەوە بە خۆمم گوت؛ نابێت وەک پێشتر لە هەموو کەسێک نزیک ببمەوە، نابێت بە چاکەوە بەرەو هەموو کەسێک برۆم و خۆم بۆ کەسانێک ماندوو بکەم کە هیچ شتێکیان بۆ من نەکردووە. هیچ نییەتی چەشتنەوەی ئەو ئازارانەم نییە. لە خەڵک دوورکەوتمەوە. تاقەتم نییە کێ باشە و کێ خراپە.

تەنها ئەوەندە دەزانم کە ئێستا وەک پێشتر نیم. ئیتر هێزی ئەوەم نییە خۆم بدەمە دەست کەسێک، خۆشمبوێت و متمانەی پێ بکەم. بە خەیاڵمدا نایەت خۆشتاندەوێم یان نا. من خۆمم خۆشدەوێت.

هەروەک 'سەباح الدین' گوتویەتی:
"ئەوەندە لە مرۆڤەکان دەترسم. خۆم لە باڵکۆنێکەوە هەڵبدەمە خوارەوە باشترە لەوەی خۆم بدەمە دەست کەسێک."

قسەیەکی شامانی دەڵێت:

**"پەیوەستبە بە خۆشەویستەکانتەوە، بەڵام ئالودەیان مەبە.**

**فیداکاریان بۆ بکە، بەڵام خۆت مەکە بە فیدایان.**

**دوێنێ لەبیرمەکە، بەڵام لەوێشدا مەژی.**

**ئارام بگرە، بەڵام بەرگەی مەگرە.**

**ڕەخنە بگرە، بەڵام تاوانباری مەکە.**

**داوا بکە، بەڵام زۆری لێ مەکە.**

**وە لە هەمووی گرنگتر؛ بەندایەتی بۆ کەس مەکە.**

**هەرگیزیش لەبیری مەکە کە ڕۆژێک هەموومان هەر دەمرین.**

**لە ڕاستیدا هەموو شتێک پەیوەندی بە هاوسەنگییەوە هەیە. بۆیە بە باشی ڕێکیبخە.**

پێموایە ئەم ڕستەیەی 'فریدا کاهلۆ' ئەگەر
کەمیش بێت ژیانمان دەگۆڕێت:

**"بە وازهێنان لێیان دەتوانیت ڕزگارت ببێت لەوانەی بە هەوڵدان بۆت چاکنەکراوەتەوە"**

لە بیرکردنەوە لە خۆت، نەهێشتنی ئازار و کێشە، گوێ بە هیچ نەدان و هەستانەوە دوای کەوتندا وەک 'بۆب مارلێی' بە. سەیرکە 'بۆب مارلێی' چەند جوان ئەم دۆخەی کورتکردوەتەوە: "هەرگیز خۆت خەمبار مەکە لەبەر کەسێکیتر. لەبیری مەکە، ئەگەر تۆ بتوانیت بەرگەی بگریت ئەوا ئەوانیش دەتوانن بەرگەی بگرن."

دوای ئەوەی ئەم ڕستەیەم خوێندەوە هەندێک شت لە مێشکمدا گۆڕان. با لە مێشکی تۆشدا هەندێک شت بگۆڕێت. من ئیتر لەبەر خاتری کەس خۆم خەمبار ناکام. لە دڵخۆشی خۆم کەمناکەمەوە تا کەسانیتر دڵخۆش بکەم، بە هیچ جۆرێک هەوڵ نادەم ئەو کەسانە ڕازی بکەم کە هیچی منیان بە دڵ نییە. لە ژیانی مندا ئیتر کێ چی بچێنێت ئەوە دەدوورێتەوە. منیش مرۆڤم. زۆر جوان لەو شتانە ڕزگارم بوو کە دەیانگوت ناتوانیت ڕزگارت ببێت. هەموو ئەو شتانەی گوتیان ناتوانیت بیکەیت کردم و سەرکەوتووبووم. کاتێکیش گوتیان ناتوانیت بەرگەی ئەم هەموو شتە بگریت، بەتەنها بەرگەی هەموویم گرت. بۆیە

ئەوانیش دەتوانن بەرگەی بگرن. من وازم لەوە هێناوە هەوڵ بۆ خەڵک بدەم و خۆمیان بۆ خەمبار بکەم. وە تەنها تەرکیزم کردۆتە سەر ژیانی خۆم. لە ژیانێکدا کە هەموو کەس بەس بیر لە خۆی دەکاتەوە و لە پشت بەهانەکانەوە خۆی دەشارێتەوە، ئیتر منیش بە ڕێی خۆمدا دەڕۆم.



**زۆریش خۆم ماندووکردووە**
**بۆ کەسانێک کە هیچ شایەنی نەبوون.**

## واز لە چاکەکردن مەهێنە

بەرامبەری هەموو چاکەیەک بەو شێوەیە بۆمان ناگەڕێتەوە کە ئێمە دەمانەوێت. هەندێک کاتیش نارەزایی دەردەبڕین و دەڵێین؛ "ئەمەش هیچی لەبەرچاو نییە". تەنانەت کاتێک دێت بیر لە وازهێنان لە چاکەکردنیش دەکەینەوە. بەڵام نابێت وازبهێنین. چاکە کارێکە کە بەبێ چاوەڕوانیکردنی بەرامبەر دەکرێت و دەبێت لە دڵەوە بێت. ئەو چاکەیەی چاوەڕێی بەرامبەرکەی دەکەیت چاکە نییە بەڵکو بازرگانییە. هەرچییەک بێت تۆ هەر واز لە چاکەکردن مەهێنە.

ڕۆژێکیان دەروێشێک دوپشکێک دەبینێت کەوتۆتە ناو ئاوەوە و دەیەوێت ڕزگاری بکات. کاتێک دەستی بۆ درێژ دەکات دوپشکەکە پێوەی دەدات. دەروێشەکە دووبارە هەوڵدەداتەوە بۆ ڕزگارکردنی و دوپشکەکە دووبارە پێوەی دەداتەوە. ئەو کەسانەی ئەم ڕووداوە دەبینن خۆیان پێ ناگیرێت و دەڵێن: "بۆچی هێشتا یارمەتی دەدەیت کاتێک سەرەڕای ئەوەی دەتەوێت

یارمەتی بدەیت ئەو زیانت پێ دەگەیەنێت؟" دەروێشەکەش لە وەڵامدا دەڵێت: "پێوەدان لە فیترەتی دوپشکدا هەیە، لە فیترەتی منیشدا خۆشویستنی خودا و میهرەبانی هەیە..."

**"بەردەوامبە لە چاکەکردن.**
**ئەگەر کەسی بەرامبەریشت شایەنی ئەو چاکەیە نەبێت**
**بەڵام تۆ شایەنی ئەو چاکەیەیت."**

چێ گیڤارا

تەنیاحاجی

**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحیم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایەن "هەمیشە جەبار" کراوە**

**بە pdf و پێشکەش بە خوێنەران کراوە**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22



t.me/tanyahaji7

## ئەمە یەکەم دۆڕانم نییە

تۆ یەکەم کەس نیت کە ئازارتدابێتم. یەکەم کەس نیت کە دڵمت شکاندبێت، ماندووتکردبێتم و منت گریاندبێت. ئەمە یەکەم ڕووخانم نییە. پێش تۆش ڕووخاوم. پێش تۆش ئازارم چەشت و گریام. یەکەم جار نییە دڵم بشکێت. کەسە ئازیزەکانم منیان خست، بەڵام هەتا ئێستا هەموو جارێک هەر خۆم بەتەنها هەستاومەتەوە سەرپێ. خۆم برینە قوڵەکانمم ساڕێژکرد.

زۆر کەس پێی گوتم؛ "لەلاتم"، بەڵام هەر بەتەنها گریام. بە کورتییەکەی ئەوانەی تۆش پێت کردم سەریان نەسوڕماندم. چونکە پێشتر هەموویم بەرامبەر کراوە. تۆش هەر وەکو ئەوانیت. من دووبارە هەڵدەستمەوە سەر پێ. بەڵام تۆ کەسێکت دەست ناکەوێت وەک من خۆشیبوێت.

**ئەو ساتەی بینیم ئازاری من دەدەیت و باوەش بە کەسانیتردا دەکەیت**
**وازم لە خۆشویستنی تۆ هێنا.**

## کەمێکیش تۆ هەوڵبدە

بەشی پێویست هەوڵم بۆ هەردووکماندا و شەڕم کرد. سەرەڕای ئەوەی دەمزانی لە ڕێگەیەکی هەڵەدام، بەڵام بۆ ساتێک لەو ڕێگەیە لامنەدا کە بەرەو تۆ دەهات و هەر بەرەو تۆ هەنگاومنا. دەبێت هەردوو لایەنەکە هەوڵبدەن تا پەیوەندییەکەیان بەردەوام بێت. ئەگەر کەسێک خۆشەویستی لە دڵیدا هەبێت ئەوا هەموو شتێک دەکات. دەبێت بیکات. منیش کردم. ناتوانیت بڵێیت نەتکردووە، کردم. وە ویژدانم ئاسوودەیە.

هەندێک کات پڕ بووم و لە هەموو شتێک بێزار بووم. بەڵام نەچووم باسی هیچ کەس بکەم. هەر خۆمم خواردەوە. بۆ یەک جاریش بێت نەمهێشت هەست بە هیچ بکەیت. باسی فیداکاری ناکرێت، بەڵام دوای ماوەیەک مرۆڤ وا هەست دەکات بە خۆڕایی سەوڵ لێدەدات و زۆر بە ڕوونی دەبینێت ئەو ڕێگایەی پیایدا دەڕوات داخراوە، ئەو کاتە لە هەندێک شت تێدەگات. منیش ئەو کاتە تێگەیشتم.

من کە چەندین جار بینیم تۆ جگە لە قسەکردن لە جێی خۆتەوە هیچ شتێکیتر ناکەیت و زۆر بە ڕوونی تێگەیشتم هیچ شتێک ناگۆڕێت، ئیتر وازم لە شەڕکردن و هەوڵدان بۆ هێشتنەوەی ئەم پەیوەندییە هێنا. ئەم هەموو کاتە هەر چاوەڕێی

شت بوویت لە من. منیش لەبەر خۆشەویستییەکەم هەموویم کرد. بەڵام ئیتر وازمهێناوە لە هەموو هەوڵەکانم، کردنی ئەوانەی تۆ نایکەیت، شەڕکردن، هەوڵدان و ماندووکردنی خۆم تا تۆ ماندوو نەبیت و خەم نەخۆیت.

چۆن دوو کەڕەتی دوو دەکاتە چوار ئەنجامی پەیوەندی ئێمەش ئاوا ڕوونە لەبەرچاوم. من ماندووبووم. کەمێکیش تۆ هەوڵ بدە. یانیش بەبێ من بەردەوامبە لە ڕێگەکەت. منیش لە ناو توێکڵی خۆمدا دەمێنمەوە.



**لەم کاتەدا کە بە قسە بێت هەموو کەس**
**یەکتریان زۆر خۆشدەوێت**
**بەڵام هیچی ڕەنگناداتەوە سەر کردارەکانیان،**
**من بۆخۆم لەگەڵ خۆمدا دەمێنمەوە.**

## بۆ کەسانێک خۆت ماندوو بکە
## کە شایەنی ئەو خۆماندووکردنە بن

هەروەک پێشتریش گوتم، ئەگەر کەسێک بیەوێت بڕوات تۆ ناتوانیت لەلای خۆت بیهێڵیتەوە. ئەوەی بشیەوێت لەلات بێت هەرچییەک ببێت هەر لەگەڵت دەمێنێتەوە. نازانم ئەمە قسەی کێیە، بەڵام قسەیەکی زۆر جوانە و دەڵێت: "داپیرم هەمیشە دەیگوت ئەگەر کەسێک بیەوێت بڕوات بە چل حەبلیش بیبەستیتەوە هەردەڕوات. ئەوەش کە دەیەوێت بمێنێتەوە تاڵە قژێکی بەسە."

با ژیانتان پڕ بێت لەو کەسانەی لە کاتی کێشەکاندا لەگەڵتاندا دادەنیشن و هەوڵدەدەن ڕێگە چارەیەک، خاڵێکی هاوبەش بدۆزنەوە، نەک ئەو کەسانەی لە بچوکترین کێشەدا ڕوو لە دەرگاکە دەکەن. وە ئەگەر هەر هەوڵیش دەدەن، هەوڵ بۆ ئەو کەسانە بدەن کە لەلاتان دەمێننەوە، نەک ئەوانەی بەدوای بەهانەیەکدا دەگەڕێن بۆ ڕۆیشتن. ئەوانە بەڕێبکەن کە دەیانەوێت بڕۆن. بە جوانترین شێوەش پێشوازی لەوانە بکەن کە دەیانەوێت لەلاتان بمێننەوە. چاوەڕێی خۆشەویستی لە کەسانێک مەکەن کە بەهانە دەهێننەوە بۆ بڕیارەکانی ژیانیان. دواتر هەر ئێوە خەم دەخۆن. ئەوان بەکەڵکی خۆیان نایەن تا بەکەڵکی ئێوە بێن.

هەبوونی ئەو کەسانەی بێجگە لە دەنگی دڵیان هەموو دەنگێکیتر دەبیستن لە ژیانتدا هیچ سوودێکی بۆ تۆ نابێت. هەر پێویستیش ناکات لە ژیانتدا بن. واتە بوون و نەبوونیان وەک یەکە.



**هەوڵ بۆ هێشتنەوەی کەسێک مەدە کە دەیەوێت بڕوات.**
**ڕۆیشتووەکان بەڕێ بکە و پێشوازی لە هاتووەکان بکە.**
**تۆش مرۆڤیت، شایەنی ئەمانە نیت.**

**هەروەک 'جاندان ئێرچێتین' دەڵێت؛**
**"ئەگەر دەتەوێت دڵخۆشبە و ئەگەر دەتەوێت شێتبە."**

من ئیتر ئەو کەسەی جاران نیم. چیتر بە زەردەخەنەیەکت و بە نامەیەکت هیچ ناگۆڕێت. ناتوانیت بیگۆڕیت، ڕێگەت پێ نادەم. ناتوانم کاتێک تۆ کاتی خۆشت لەگەڵ کەسانیتردا بەسەردەبەیت من بە هۆی تۆوە ژیان لە خۆم بکەم بە ژەهر. تۆ لە من گرنگتریت؟ کاتێک خەمدەخۆم، فرمێسک دەڕێژم و ئازار دەچێژم تۆ لە من زیاتر خەمم بۆ ناخۆیت. چیتر هەرکەسێک چۆن بەرەو من هات منیش ئاوا بەرەو ئەو دەڕۆم. کێ چۆن لە من بڕوات منیش ئاوا دەڕۆم. لەمە بەدواوە ئاوایە، با بزانیت.

**هاتینە کۆتایی ئەو کاتەی بۆ تۆ دابینکرابوو و**
**لەوێوە پێت دەڵێم:**
**شایەنی هیچ هەوڵدانێکم نیت...**

**"ئەگەر هەموو شتێک وەک ئەوە بووایە کە دەیبینیت،**
**ئەوا کاتێک دەستت پڕ دەکرد لە ئاوی دەریا،**
**ئاوەکە هەر شین دەبوو."**

## هەموو کاتێک بینین بە واتای تێگەیشتن دێت؟

زۆربەی کەس دەڵێت؛ "من باوەڕم بەوە هەیە بە چاوەکانی خۆم دەیبینن" و بەپێی ئەمە دەژیم.

هەروەک چۆن جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان بیستن و تێگەیشتندا، بە هەمان شێوە جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوان بینین و تێگەیشتندا. لە ڕاستیدا دەکرێت زۆربەی کات ئەو شتانەی دەیانبینین بە هەڵەماندا ببەن. هەموو کاتێک بینین بە واتای تێگەیشتن نایەت. ئەمانە دوو شتی جیاوازن و زۆربەی کات مرۆڤ لەو جیاوازییە تێناگات. ئەگەر لە جیاتی ئەوەی هەر کە بینیمان یەکسەر بڕیار بدەین و بگەین بە ئەنجامێک، کەمێک بە ئارامی بمێنینەوە و هەوڵ بدەین لە ڕووداوەکە تێبگەین هەموو شتێک زۆر جیاواز دەبێت. وەرن با چیرۆکێکتان بۆ باس بکەم لەمبارەیەوە؛

دوو فریشتەی گەڕۆک لە دەرگای خێزانێکی زۆر دەوڵەمەند دەدەن، تا شەو لەلایان بمێننەوە. ئەم دوو فریشتەیە بەو شێوەیە پێشوازیان لێ نەکرا کە چاوەڕێیان دەکردن، خێزانەکە زۆر بە لوتبەرزییەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ کردن و لە جیاتی ئەوەی لە ماڵە گەورەکەیاندا ژوورێکی میوانیان بۆ ئامادە بکەن، بردیانن

بۆ بەشێکی ساردی ژێرزەمینەکەیان. کاتێک دوو فریشتەکە خەریکی ئامادەکردنی جێگای خەوەکانیان بوون لەم شوێنە ساردەدا فریشتە پیرەکە کونێک دەبینێت لە دیوارەکەدا و خێرا هەڵدەستێت و دەست دەکات بە پڕکردنەوەی کونەکە.

فریشتە گەنجەکە نەیتوانی لەمە زیاتر سەرسوڕماویی خۆی بشارێتەوە و پرسیاری هۆکاری ئەم کارەی لە فریشتە پیرەکە کرد. فریشتە پیرەکە زەردەخەنەیەکی کرد و لە وەڵامدا گوتی؛ "هەموو کاتێک هەموو شتێک وەک ئەوە نییە کە دەیبینیت..."

کە ڕۆژبووەوە ئەم دوو فریشتە گەڕۆکە ماڵەکەیان بەجێهێشت. شەو داهات و ئەمجارە دوو فریشتەکە لە دەرگای ماڵی ژن و مێردێکی جوتیاری هەژاریان دا.

ئەم خێزانە هەتا بڵێی بە باشی پێشوازیان لێ کردن و کەسانی زۆر باشبوون. هەرچییەک لەسەر سفرەیەکەیان بوو لەگەڵ فریشتەکاندا بەشیانکرد و دواتر جێگاکەی خۆیانیان پێدان تا تیایدا بخەون. دووبارە کە ڕۆژبووەوە دوو فریشتەکە بینیان ژن و مێردە جوتیارەکە دەگرین. لاشەی بێگیانی ئەو مانگایەی تاکە سەرچاوەی داهاتی ئەم خێزانەبوو لە ناوەڕاستی کێڵگەکەیاندا کەوتبوو.

فریشتە گەنجەکە زۆر توڕەبوو و بە فریشتە پیرەکەی گوت؛ "چۆن ڕێگە بە شتی وا دەدەیت؟ ئەو خێزانە دەوڵەمەند و لوتبەرزە هەموو شتێکیان هەبوو. بەڵام هەر یارمەتیتدان و دیواری ماڵەکەیانت چاککردەوە. ئەم خێزانە دڵباش و هەژارەش

بێجگە لەو مانگایە هیچ شتێکی تریان نەبوو. سەرەڕای ئەمەش هەر ویستیان ئەومان لەگەڵدا بەشت بکەن. بەڵام تۆ ڕێگەت دا ئەو مانگایە لەدەست بدەن!"

دوای ئەم قسانە فریشتە پیرەکە ڕووی لە فریشتە گەنجەکە کرد و پێی گوت: " هەموو کاتێک هەموو شتێک وەک ئەوە نییە کە دەیبینیت. ئەو شەوەی لە ژێرزەمینی خێزانە دەوڵەمەندەکەدا ماینەوە، لە ناو دیوارەکەدا دنیایەک ئاڵتونم بینی. لەبەر ئەوەی ئەندامانی ئەو خێزانە ئەوەندە بەرچاو تەنگبوون و نەیاندەویست کەمێکیش لەو دەوڵەمەندییەی کەپێیان بەخشراوە لەگەڵ کەسانی تردا بەش بکەن، منیش ئەو کونەم وا داخست کە ئەگەر بیشیدۆزنەوە نەتوانن دەریبهێنن. وە دوێنێ شەو کاتێک ئێمە خەوتبووین فریشتەی مەرگ هات تا ژنی جوتیارەکە ببات. منیش لە جیاتی ئەو مانگاکەم پێدا."

فریشتە پیرەکە بە زەردەخەنەیەکەوە بەردەوامبوو لە قسەکانی: "هەموو کاتێک هەموو شتێک وەک ئەوە نییە کە دەیبینیت. ئەو شتانەی بەسەرماندا دێن کاتێک ژیانمان وەک ئەوە ناڕوات کە دەمانەوێت ڕێک ئاوان. زۆربەی کات تاکە شت کە دەبێت بیکەن باوەڕکردنتە بەوەی ئەنجامی هەموو شتێک لە بەرژەوەندی تۆدا دەبێت. هەرچەندە دوای ماوەیەکی دیاریکراو ئینجا فێردەبین ئەمە ئاوایە، هەندێک کەس دێنە ژیانمانەوە و بە زوویی دەچنە دەرەوە. هەندێکیشیان دەبن بە دۆستمان و ماوەیەکی زۆر لە دڵماندا دەمێننەوە و شوێنپەنجەی خۆیان لە

دڵماندا جێدەهێڵن. وە ئەمە واتا مادەم دۆستێکی باشمان پەیدا کردووە ئیتر هەرگیز وەک پێشترمان لێ نایەتەوە. دوێنێ بوو بە ڕابـردوو. بەیانیش ناڕوونە. ئەمڕۆش دیارییەکە و پێمان بەخشراوە. بەڕای من ئەمە شتێکی زۆر تایبەتە... بۆیە چێژ لە هەموو ساتێک ببینن و قەدری بزانن"...

## ئایا کەس هەمیشە دەدۆڕێت؟

ئەری کەس هەمیشە دەدۆڕێت؟ جگە لە کەسە خۆشەویستەکانی هیچ شتێکی باش نایەتە ژیانییەوە؟ دڵخۆشی هیچ ڕووی تێناکات؟ هەموو ئەو کەسانەی متمانەیان پێدەکات پەشیمانی دەکەنەوە؟ هەموو ئەو کەسانەی خۆشیدەوێن دڵی دەشکێنن؟ هەمیشە کە بەها بەکەسێک دەدات بێ بەها دەبێت؟

با وەڵامت بدەمەوە: بەڵێ، ئەگەر هەمیشە تاکلایەنە هەوڵی بردنەوە بدەیت و لەسەر پێ بیهێڵیتەوە هەر دەدۆڕێیت. مانا بە هەموو شتێک ببەخشیت دەدۆڕێیت. هەندێک کەس بخەیتە چەقی ژیانتەوە و خۆت لە یادبکەیت دەدۆڕێیت. سەرەڕای ئەوەی بینیت کەسێکیتری خستۆتە جێگەت و هێشتا بەردەوامبیت لە خۆشویستنی ئەوا دەدۆڕێیت. هەوڵی بەدەستهێنانەوەی ئەو شتانە بدەیت کە مانایان نەماوە دەدۆڕێیت. خۆت خەمبار بکەیت تا کەسیتر خەمبار نەبێت ئەوا دەدۆڕێیت.

ئەگەر هەوڵ بدەیت ئەو کەسە بهێڵیتەوە کە دەیەوێت بڕوات ئەوا دەدۆڕێیت. بەتەنها خۆت بخەیتە ژێر بارێکەوە کە ناتوانیت هەڵیبگریت دەدۆڕێیت. ئەگەر ئەو بەهایەی دەبێت بە

خۆت بدرێت بیدەیت بە کەسیتر ئەوا دەدۆڕێیت. کەسە باشەکان نادۆڕێن، بەڵکو کەسانیتر ئەوان دەدۆڕێنن. ئەمە نەخۆشی ئەم سەردەمەیە: ئەو کەسەی خۆشویستراوە دەڕوات و ئەوەش کە هەموو دڵی خستۆتە دەستییەوە هەر دەدۆڕێت.

**کە دۆڕایت خۆت مەدە بەدەست ئازارەوە.**
**لە بیری مەکە، لە هەموو دۆڕانێکدا قازانجێک هەیە.**

**"با خۆشەویستی جوان ببێت بە ئامانجتان نەک جوانبوون. ئەگەر پێویست بکات ئەوا لە هەموو تەمەنتاندا یەک کەستان خۆشبوێت، بەڵام بەجوانی خۆشتانبوێت"**
فریدا کاهلۆ

هەندێک پیاو هەیە تەنها لەبەر جوانییەکەی ژنێکیان خۆشدەوێت. ببورە هەندێک کوڕی وا هەیە، نەک پیاو. هەندێک کەس هەیە کاتێک کەسێک دەهێننە ژیانیانەوە دەڵێن با چاوی جوان بێت، کەمەری باریک بێت، لووتی بچووک بێت، قژی لوول بێت، یەکێک نەزانێت لە بازاڕدا تەماتە هەڵدەبژێرن. هیچ شتێک

نییە لەوە ناشیرینتر بێت کە بەپێی ڕوخسار و ڕواڵەت مامەڵە لەگەڵ کەسەکاندا بکرێت، چەندین ژنی جوانم بینی ناخیان وەک سەبەتەی زبڵ بوو، چەندین ژنی بە ناو ناشیرینیشم بینی کە ناخیان باخچەی گوڵە بەیبوون بوو.

ژن لەبەر جوانییەکەی خۆشناویستریت، بەڵکو لەبەر میهرەبانییەکەی خۆشدەویستریت. ژن لەبەر کەمەرە باریکەکەی خۆشناویستریت، بەڵکو لەبەر ئەوەی چای خۆش ئامادە دەکات خۆشدەویستریت، ژن لەبەر ئەوە خۆشناویستریت چاو و برۆی جوانە، بەڵکو لەبەر ئەوە خۆشدەویستریت کە کاتێک بەهەمان شێوە مامەڵە لەگەڵ هەموو کەسێکدا دەکات بە جیاوازی مامەڵە لەگەڵ تۆدا دەکات.

لەبەر ئەوە خۆشدەویستریت کە لە دواتەوە شتەکانت کۆدەکاتەوە و لە جیاتی ئەوەی وازت لێ بهێنێت و بڕوات زیاتر گرنگیت پێ دەدات. لە جیاتی ئەوەی ژنێکتان لەبەر جوانی و جەستەی خۆشبوێت، با لەبەر ئەوە خۆشتانبوێت کە خۆشەویستی باوکی نەبینیوە و نەیتوانیوە پڕ بە دڵ منداڵیی خۆی بژی. لەو شوێنەوە دەست بکەن بە خۆشویستنی کە باوکی بەجێیهێشتووە. دڵنیابن کاتێک هەمووی دەکەن ئیتر کوڕ نین، بەڵکو بوون بە پیاو.

**خۆشەویستی ژن،**

**کاتێک دەستپێدەکات کە پیاوەتی لە کوڕێکدا دەبینێت.**

# بەڵێن بە خۆم دەدەم

بەڵێن بە خۆم دەدەم؛ لەمە بەدواوە لە هیچ شوێنێک و لەلای هیچ کەسێک نامێنمەوە کە وابکات هەست بە بێ بەهایی بکەم. بەڵێن بە خۆم دەدەم؛ هەموو ئەو کەسانەی وەک کەسێکی ئاسایی مامەڵەم لەگەڵ دەکەن لە ژیانم بکەمە دەرەوە. بەڵێن بە خۆم دەدەم؛ کێ چەنێک بەها بە من بدات منیش ئەوەندە بەهای پێ دەدەم کە شایەنییەتی. بەڵێن بە خۆم دەدەم؛ بە کەس ناڵێم مەڕۆ. بەڵێن بە خۆم دەدەم: خۆشەویستی بۆ کەسێک دەرنەبڕم کە هیچ خۆشەویستیم بۆ دەرنابڕێت. بەڵێن بە خۆم دەدەم؛ هەوڵ نادەم ئەو کەسانە بهێنمەوە یادم کە هەوڵ دەدەن خۆیانم لە بیرببەنەوە. بەڵێن بە خۆم دەدەم؛ بە تەنها هەوڵ نادەم بۆ هێشتنەوەی هیچ شتێک. ئیتر بەتەنها بەڵێن بە خۆم دەدەم. لەمە بەدواوە تەنها بەها بە خۆم دەدەم. چونکە لە خۆم بەبەهاتر نابینم. ئەو دەفتەرەم داخستووە ئیتر. ئیتر زۆر باش دەزانم کە ئەو کەسانەی بەهام پێ دەدان گۆڕاون و شایەنی هیچ شتێک نین. بۆیە لەمە بەدواوە تەنها خۆمم خۆشدەوێت.

**کاتێک کەسێک دەبینم کە بە خۆشەویستی جوان نابێت،**
**یەکسەر لێی دووردەکەومەوە.**
**چونکە دەزانم ئەو لە هەموو کەسێک زیاتر ئازارم دەدات.**

## جا وەرە باوەڕیان پێ بکە

کاتێک سەیرێکی ڕابردوو دەکەیت، چەند کەس لەوانەی گوتیان؛ "هەرگیز ناڕۆم" لەلات ماونەتەوە؟ ئەی تۆ چەند جار گوتت؛ "جارێکیتر متمانە بە کەس ناکام" و بەڵێنت شکاند؟ چەند کەس لەوانەی گوتیان "لەلاتم" کاتێک کەوتیت دەستی یارمەتییان بۆ درێژ کردیت؟ هەموو جارێک هەر خۆت هەڵنەستایتەوە سەر پێ؟ بەڵێ خۆت هەستایتەوە. وە هەموو جارێک ئازاری لە خۆت گەورەترت نەخستە سەر شانت؟ ئەمە چییە؟ ئەمە نە یەکەم ڕووخانتە و نە یەکەم دڵ شکانتە.

مەڵێ ئەمە هەرگیز تێناپەڕێت، هەر وەک چۆن ئەوانەی تر تێپەڕین ئەمیش تێدەپەڕێت. ئێستا هەستەرەوە سەر پێ. پێویستت بە کەسیتر نییە، بەتەنهاش دەتوانیت بەردەوامبیت لە ڕێگاکەت. زۆر کەس گوتیان؛ "لەلاتم"، بەڵام بە تەنها لە ناو ئەو هەموو ئازارە هاتیتە دەرەوە. گریایت، بەڵام خۆت فرمێسکەکانت سڕی. ئەمانە لەبیرمەکە.

**زۆر کەس پێت دەڵێت؛ "لەلاتم".**
**جا وەرە باوەڕیان پێ بکە.**



**پێویستم بە کەسانێکە کە کاتێک**
**لە وەڵامی؛ "چۆنیت؟"دا دەشڵێم باشم،**
**هەست بکەن کە باش نیم.**

## تۆ ئێمەت لەناوبرد،
## من تۆم لەدەستدا و تۆش ئێمەت لەدەستدا.

بەردەوام دەتگوت کە منت خۆشدەوێت، بەڵام هەر من بەردەوام هەوڵم دەدا بۆ هێشتنەوەی ئەم پەیوەندییە و هەرچیم لەدەست دەهات دەمکرد بۆ پاراستنی. عەشق کوێرییەکی کاتییە. منیش جگە لە خۆشەویستی تۆ چاوم هیچیتری نەدەدی. بەڵام خوا دەزانێت چەند چاوەڕێم کرد منت خۆشبوێت. واز لەوانە بێنە کە بۆ تۆم کرد و بۆ ئەم پەیوەندییەم کرد. زۆر چاوەڕێم کرد منت خۆشبوێت. ئەمە لە یادمەکە. چاوەڕێم کرد... لە کاتێکدا هەموو کەسێک بە چرکەیەک دەڵێت؛ "خۆشمدەوێیت" بەڵام کەس چاوەڕێی کەس ناکات، من چاوەڕێم کرد تا منت خۆشبوێت. بەڵام منت خۆشنەویست. بە ئومێدی خۆشویستنمەوە هەنگاوم بەردو تۆ دەنا، بەڵام لە هەموو هەنگاوێکمدا وات دەکرد تا سەر ئێسقان هەست بە خۆشنەویستراوی خۆم بکەم. لە دونیایەکدا قەوزەش باوەش بە بەردا دەکات تۆ هەر منت خۆشنەویست.

کەس لە تۆ باشتر نییە لە پشتگوێخستندا. لە کاتێکدا کە

من جگە لە تۆ چاوم هیچیتری نەدەبینی، تۆ هەر منت پشتگوێ خست. تۆ واتکرد لە جیاتی بڵێیت؛ "باشبوو یەکمان ناسی" بڵێین؛ "خۆزگە تۆم هەر نەناسیایە". لەمە بەدواوە لەگەڵ کێدا دەبیت ببە، دەچیت بۆلای کێ بچۆ و ماچی کێ دەکەیت بیکە. ویژدانت هەمیشە ئەمەت بیر دەهێنێتەوە: تۆ ئێمەت لەناوبرد...



**مرۆڤ ناتوانێت دوو شت لە یاد بکات لە ژیانیدا.**
**یەکێکیان ئەوەیە کە خۆشیویستووە،**
**ئەوەی تریشیان ئەو کەسیە کە خۆشینەویستووە،**
**من هەموو ئەو شتانەم خۆشویست کە تۆی تیابوویت،**
**بەڵام تۆ هەموو شتێکت خۆشویست بێجگە لە من.**

## با دڵت ئاسوودە بێت

جارجار بێهیوا دەبم. وزەی ژیانم کەم دەبێتەوە. پەیوەندیم لەگەڵ هەموو شتێک و هەموو کەسێکدا دەپچڕێنم. واتە بۆ ماوەیەکی کورت دەچمە خەڵوەتەوە. دوای ماوەیەک هەست دەکەم ناحەقی هەم بەرامبەر خۆم دەکەم و هەم بەرامبەر ژیانم.

کاتێک هێزی یەک هەنگاویشم پێ نەماوە، ئەم وتە ئارامبەخشانەی حەزرەتی مەولانا دەهێنمەوە یادی خۆم: "خودا تۆ لە هەموو کەسێک باشتر دەناسێت. لەوانەیت کە یان بە هەڵە دەتوانن یان بە ناتەواوی. خەمبار مەبە بەهۆی ئەو کەسانەی دەیانەوێت خەمبارت بکەن، کاتێک دێت کە تۆش دڵخۆش بیت. هەموو کەسێک وەک ئەوانە مەبینە کە دەیانەوێت خەمبارت بکەن. کەسێک هەر دێت دڵخۆشت بکات. مەڵێ ئەمڕۆ زۆر دەردەدارم، ئەو خودایەی ئەو دەردەی بۆ ناردوویت ڕۆژێک دەواکەشیت بۆ دەنێرێت. تۆ نزا بۆ خودا بکە. مەڵێ جا نزاش

بکەم چی دەگۆڕێت. ڕۆژێک دێت نزاکانیشت قبوڵ ببێت". تۆش هەر کاتێک کەوتیتە تەنگانەوە، هەر کاتێک هێزی هەنگاوێکیشت پێ نەما ئەم قسانە بهێنەرەوە یادی خۆت، دڵنیام وا دەکات هەست بە باشی بکەیت.

با دڵت ئاسوودە بێت، هەموو شتێک چارەسەر دەبێت.



**هەر کاتێک دڵتەنگ بوویت،**
**هەر کاتێک بێ ئومید بوویت،**
**یادی خودا بکە. ئەو هەر لەگەڵتە.**

## "واز لە هەموو ئەو شتانە بهێنە
## کە گومانیان لێ دەکەیت."

هەروەک هەموومان دەزانین، گەورەترین کێشەی ئەم سەردەمە نەبوونی متمانەیە. ئەگەر سەرەڕای هەموو شتێک، هەموو کەسێک، ئەم سەردەمە و ئەم هەموو خراپەکارییە هێشتا کەسێک هەیە کە متمانەی پێ دەکەیت و باوەڕت پێیەتی ئەوا دەبێت قەدرت بزانێت. چونکە متمانە یەکێکە لە گەورەترین دەوڵەمەندییەکانی ئەم دونیایە. ئەگەر سەرەڕای هەموو شتێک هێشتا متمانە بە کەسێک یان شتێک دەکەیت، بەڵام سەرەڕای ئەمەش تۆ دەخاتە گومانەوە ئەوا یەک چرکەش لەوێدا مەمێنەرەوە.

چونکە ئەگەر ئەو شتەی تۆی خستۆتە گومانەوە شتێکی ڕاستبوایە بۆ تۆ، ئەوا هەرگیز نەیدەخستیتە گومانەوە، هەرگیز ئەمە لە بیر مەکە.

هەر شتێک ڕوون بێت ئەوا خۆیت نیشان دەدات و تۆش هەستی پێ دەکەیت. مەچۆرە ناو ئاوێکەوە کە بنەکەی نابینیت.

واز لە هەموو ئەو شتانە بهێنە کە نیشانەی پرسیارت لەلا درووست دەکات و دەتخاتە گومانەوە. هەموو ئەو کەس و شتانە

بسرەرەوە کە سەرەڕای ئەوەی دەشزانن هێندە بە ئاسانی متمانە بە کەس ناکرێت، ئەو متمانەیەی تۆ فڕێ دەدەن، بەهای نازانن و دەتخەنە گومانەوە. هەروەک حەزرەتی مەولانا-ش دەڵێت:

"بە نەبوونتان وانەی ئەو کەسانە دابدەن کە قەدری هەبوونتان نازانن". هەوڵ مەدەن بۆ باوەڕکردن بە هیچ کەس و هیچ شتێکی ناڕوون.



**هەموو شتێک لەلایەک،**
**بەڵام شتە ناڕوونەکان من زۆر ماندوو دەکەن.**

**ئەها دەڵێن؛**
**"ئەگەر بەردبوایە لە جێی خۆی شەقی دەبرد،**
**بەڵام دەزانیت دڵ هەر چاوەڕێتە."**

چیتر، من هێندە بێ هەستم، کە جارێکیتر کەسم خۆشنەوێت، هێندە بێ متمانەم کە جارێکیتر دڵم نەشکێت. هەموو ئەو کەسانە حەواڵەی خودا دەکەم کە منیان خستۆتە ئەم دۆخەوە و بوونەتە هۆی ئیفلاسی هەستەکانم. نامەوێت ئەو کەسانەی لە کاتی

ماندوێتیمدا دیار نین، لە کاتی پشوودانمدا دەربکەونەوە. کاتێک بیر لەوە دەکەمەوە کە هەموو ئەو کەسانەی متمانەم پێ کردوون منیان نا ئومێد کردووە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەرمان (د.خ) دەهێنمەوە یادم: "ئەوەی ئازار دراوە با ئارام بگرێت. ئەو کەسەی ئازاری کەسێکیداوە با چاوەڕێی ئەو ڕۆژە بکات کە ئازاری دەدرێتەوە". دادپەروەری خودا بە ووردی جێبەجێ دەکرێت، بۆیە منیش چاوەڕێی ئەو ڕۆژەم کە ئەوانەی ئازاریانداوم ئازاردەدرێنەوە.

**لەوانەیە لەو شتانە خۆش ببم کە بەرامبەرم کراون،**
**بەڵام لەیادیان ناکەم.**
**هەروەک حەزرەتی مەولانا دەڵێت:**
**"خودا ڕۆژێک هەر لێپێچینەوەتان لێ دەکات**
**لەسەر ئەو برینانەی درووستتان کردووە..."**

**"پشت بە کەس مەبەستە جگە لە دیوار.**

**کامەی لە هەمووی باشترە، ئەگەر تۆزێکیش بێت هەر ناپاکی لە دڵیدایە."**

کەستان هێندە خۆشنەوێت کە سەرەڕای ئەوەی ناپاکی لێ کردووە بڵێن؛ "چانسێکیتری پێ بدەم؟" و چانسێکیتری پێبدەن. کەس مافی ئەوەی نییە کەسێکیتر بخاتە جێگەتان و دواتریش بێت و داوای لێبوردن بکات، کەس شایەنی ئەمە نییە. ئەو کەسانەی هیچ حسابێکیان بۆ متمانەتان و ئەو چانسانە نەکردووە کە پێتانداون و ناترسێت لە لەدەستدانی ئێوە و کەسێکیتر دەخاتە جێگەتان، لە ژیانتاندا مەیانهێڵن. ناچارنین گرنگی بەو کەسانە بدەن کە گرنگیتان پێ نادەن. ئەو کەسانەی ناپاکی دەکەن، خەمبارتان دەکەن، دڵتان دەشکێنن و دواتریش داوای لێبووردنتان لێ دەکەن، زۆر ئارەزوو دەکەن ئاو لەو پەرداخەدا بخۆنەوە کە فڕێیانداوەتە سەر زەوییەکە هەرچەندە دەشیانزانی دەشکێت. زۆر کەیفیان بەمە دێت. ڕێگە بە کەس مەدەن داوای لێبووردن بۆ ئەو هەڵانە بکات کە هەرچەندە

ئەنجامەکەشی بە باشی زانیوە هەر کردویەتی. هەمیشە دەڵێم متمانە یەک جار بەدەست دەهێنرێت. لەوانە خۆشمەبن کە لەدەستی دەدەن. ڕێزی خۆتان لە پێش هەموو شتێکەوەیە لەم ژیانەدا. نەکەن لەدەستی بدەن.

هەروەک 'تورگێنییڤ' دەڵێت:

**"ساتێک دێت کە ڕێی گەڕانەوە نامێنێت،**
**لێبووردەیی بۆ هەندێک هەڵە نامێنێت،**
**مانای هەندێک کەس نامێنێت!"**

## وازهێنان ئاسانە بۆ ئەوانەی هیچ ئەمەکیان پێ نەداوە.

باشە بۆچی خۆشیانناوێین؟ زۆر ناشیرینین؟ بە پێچەوانەوە خاوەنی دڵێکی زۆر جوانین کە شایەنی خۆشویستنە. کەواتە بۆچی خۆشناویسترێین؟ ئەوان بێ دڵن؟ یان ئێمە شایەنی خۆشویستن نین؟ ئەمەک بەو کەسانە دەدەین کە شایەنی نین. چاوەڕێین کەسانێک خۆشیانبوێین کە خۆشەیوستی نازانن. ئەی ئەنجام؟ هەمیشە لە کۆتاییدا هەر ئێمە خەمباردەبین.

بەزیادەوە ئەوانەمان کرد کە دەبوو بیکەین. ئەمەکمان پێدان. بەهامان پێدان. خۆشەویستی خۆمانمان بۆ دەربڕین. باشە بۆچی هەر ئێمە دەدۆڕێین؟ تەنها ئێمە هەوڵمان دەدا. تەنها ئێمە ئەمەکمان بە خۆشەویستییەکەماندا. چاوەڕێی هەندێک شتمان کرد کە سوور دەمانزانی لە کۆتاییەکەیدا خەمبار دەبین. چاوەڕێی خۆشەویستیمان لە دڵێک کرد کە هەر نەیدەزانی خۆشەویستی چییە. نەماندەتوانی بە ئازادی وازی لێ بهێنین چونکە ئەمەکی زۆرمان بە خۆشەویستییەکەمان دابوو.

**گۆرانیبێژ 'سلا' لە گۆرانییەکیدا دەڵێت:**

**"دەزانیت بۆچی ناتوانم بڕۆم؟**

**چونکە کە ئەمەکت پێدا ئیتر قورسە بڕۆی."**

## با ئەو بیری لێ بکاتەوە

تۆ بە زیادەوە ئەوەی لە دەستت هات کردت. لەوانەیە لەبەر ئەوەشبووبێت کە پێشتر کەس ئەوەندە هەوڵی بۆ نەدابوو، بەڵام تۆ هەوڵت لەگەڵدا دا. تۆ یەکەم کەسیت ئاوای بۆ بکەت. بێگومان ئەویش نەیتوانی بەرگەی ئەمە بگرێت. لە ڕاستیدا ئەویش لەسەر حەقە. ئەو هەرچەندە دڵی ماندووبوو و دەیزانی بێهوودە دەبێت، بەڵام هەر شەڕیکرد بە ئومێدی چاککردنەوەی شتەکانەوە. حەق بەویش بدە، پێشتر کەسی وەک تۆ نەچۆتە سەر ڕێی. کە تۆ هێندە خۆشتویست، بەهات پێدا و هەوڵت لەگەڵدا دا ئەویش سەری لێ تێکچوو. بەڵام هەر خەم مەخۆ.

سەیرکە ئەم دۆخە قسەیەکی 'نەجیب فازڵ کساکورێک'ی هێنایەوە یادم: "با یار بۆ خۆی بڕوات، تۆ هەر زۆرت خۆشبوێت"، بە کورتییەکەی تۆ ئەوت خۆشویست، بەڵام ئەو نەیتوانی بەرگەی بگرێت. تۆ نا بەڵکو با ئەو خەمبخوات کە تۆی لەدەستداوە. دەمەوێت وتەیەکی 'شەمسی تەبریزی' بهێنمەوە یادت:

"تێگەیشتم کە خەڵکی کەسە بێدەنگەکان بە ترسنۆک، ئەوانەی هەڵەکان پشتگوێ دەخەن بە گەمژە و لێبووردەکان بە

جانتای دەستیان دەزانن. بەڵام هەتا ئەو شوێنە لە ژیانماندان کە ئێمە دەمانەوێت. هێندەی لێبووردەییمان ڕاستگۆن و هێندەی بێدەنگبوونمان مرۆڤن."



**تۆ ئەوت خۆشویست بەڵام ئەو**
**نەیتوانی بەرگە بگرێت.**
**ئەمە هەڵەی ئەوە نەک تۆ.**

## تۆ بەسیت بۆ خۆت

بابەتەکە زۆر سادەیە، کێ چۆن هەڵسوکەوتت لەگەڵ دەکات تۆش ئاوا هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکەرەوە. چی دەبێت با ببێت. با بڵێن؛ "لە خۆت گۆڕاویت". با بڵێن؛ "لووتبەرزیت". دڵنیابە کاتێک ئەمانە دەڵێن کە ناتوانن وەک پێشتر سوود لە تۆ ببینن. گوێیان مەدەرێ. تۆ بۆ ڕازیکردنی کەسانیتر نەهاتویتەتە ئەم ژیانەوە. نەهاتوویت بۆ چاککردنەوەی ئیشی کەسیش. لەم ژیانە کورتەدا، بە خۆڕایی خۆتان خەمبار مەکەن بۆ ئەو کەسانەی دەبنە شاری یاری بۆ کەسیتر و بۆ ئێوەش دەبنە زوبێری دڕکدار.

هەموو کەس بەو شێوەیە هەڵسوکەوت دەکات کە دەیەوێت و هەتا بەرژەوەندییەکانی لەگەڵ تۆدابێت لەگەڵت دەمێنێتەوە. لە بیری مەکە لەم سەردەمەدا ئەوەی بەرژەوەندییەکانی لەگەڵتدا تەواودەبێت خۆشەویستیشی تەواو دەبێت، ئەگەر پێویست بکات بە تەنها بمێنەرەوە، بەڵام مل بۆ کەس کەچ مەکە. لەم ژیانەدا کەس بیر لە هیچ شتێک ناکاتەوە جگە لە خۆی، تۆش ناچار نیت شەڕ بۆ کەس بکەیت. کێ چی بچێنێت ئەوە دەدوورێتەوە. لەوە زیاتر نییە. ئەگەر ئەوانیش نەبن هەر دەژیت. تۆ بەسیت بۆ خۆت.

**خەم مەخۆ و بڵێیت کەس منی خۆشناوێت.**

**تۆ لە هەموو کەسێک جوانتر خۆتت خۆشدەوێت.**

## خۆت بە کەم مەزانە

مرۆڤ هەر لە لایەنە بەهێز و بەهرەدارەکانی پێکنەهاتووە، بەڵکو کەموکورتییەکانی و لایەنە بێهێزەکانیشی بەشێکن لەو. کەسمان بێ کەموکورتی نین، هەموومان باشە، خراپە، کەموکورتی و بێهێزیمان هەیە. قبوڵکردنی خۆمان بەو شێوەیەی هەین لە هەموو شتێک گرنگترە.

کاتێک هەڵەیەک یان کەموکورتییەک لە خۆتدا دەبینیت لە خۆت توڕە مەبە، لە خۆت دوورمەکەوەرەوە. بەو شێوەیە خۆت قبوڵ بکە کە هەیت. چونکە قبوڵکردن ڕێگایەکی باشی چاکبوونەوە و چاککردنەوەیە. کاتێک قبوڵکردنتان کرد بە خوو بۆخۆتان دەبینن زیاتر ئاسوودە و دڵخۆش دەبن.

لە ڕاستیدا هەریەکەمان سەتڵێکی درزدارین. لە هیندستان ئاو فرۆشێک دارێکی خستبووە سەر شانی و دوو سەتڵی بە هەردوو لاکەیەوە بەستبوەوە و ئاوی پێ دەگواستەوە. یەکێک لە سەتڵەکان درزی بردبوو. سەتڵە بێ درزەکە هەموو جارێک بە پڕی دەگەیشتە ماڵی گەورەکەی. بەڵام سەتڵە درزدارەکە هەموو جارێک بە نیوەیی دەگەیشتە ئەوێ. ماوەیەکی زۆر بەم شێوەیە بەردەوامبوو.

ئەم ئاوفرۆشە هەموو جارێک دەیتوانی تەنها یەک سەتڵ و نیو ئاو ببات بۆ ماڵی گەورەکەی. لە کاتێکدا کە سەتڵە بێ درزەکە شانازی بەخۆیەوە دەکرد بەهۆی سەرکەوتوویی و پتەوییەوە، سەتڵە درزدارەکە شەرمی لەخۆی دەکرد چونکە تەنها نیوەی ئەرکەکەی جێبەجێ دەکرد. دوای دوو ساڵ ڕۆژێک سەتڵە درز دارەکە لەلای ڕووبارەکەوە بانگی ئاوفرۆشەکەی کرد و گوتی:

"من شەرم لە خۆم دەکەم و دەمەوێت داوای لێبووردنت لێ بکەم."

ئاوفرۆشەکە لێی پرسی؛ "بۆچی؟ بۆ شەرم لە خۆت دەکەیت؟"

سەتڵە درزدارەکە لە وەڵامدا گوتی:

"چونکە دوو ساڵە ئاو لە درزەکەمەوە دزەدەکات و بەوهۆیەوە تەنها نیوەی ئەرکەکەم پێ جێبەجێ دەکرێت. بەهۆی کەموکورتی منەوە تۆ بە تەواوی پاداشتی ئەم هەموو ماندووبوونە و هەوڵدانەت وەرناگریتەوە."

ئاوفرۆشەکە بە زەردەخەنەیەکەوە گوتی:

"دەمەوێت سەرنجی گوڵەکانی سەر ڕێگای گەڕانەوەمان بۆ ماڵی گەورەکەم بدەیت".

سەتڵە درز دارەکە گوڵە جوانەکانی سەر لایەکی ڕێگای کێڵگەکەی هێنایەوە بەر چاوی خۆی، بیریهاتەوە کە ئەو گوڵانە زۆر سەرنجی ئەوی ڕاکێشابوو و زۆر بەدڵیبوون. بەڵام لە کۆتایی ڕێگاکەدا لەبەر ئەوەی دەیزانی نیوەی ئاوەکەی لەدەستدابوو هەستی بەخراپی کردەوە و دووبارە داوای

لێبووردنی لە ئاوفرۆشەکە کرد...

لە ناکاو ئاوفرۆشەکە لە سەتڵەکەی پرسی:

"هیچ سەرنجت داوە کە تەنها لەلای تۆوە گوڵ هەیە لەسەر ڕێگاکە و لەلای سەتڵە پتەوەکەوە هیچ گوڵێک نییە؟ هۆکاری ئەمە، ئەوەیە کە من کەموکورتییەکەی تۆ دەزانم و سوودی لێ وەردەگرم... تۆوی گوڵم لەو لایەی ڕێگەکەوە چاند کە لەلای تۆوەیە و هەموو ڕۆژێک کە لە ڕووبارەکەوە گەڕاینەوە تۆ ئاوی ئەوانتدا. دوو ساڵە من ئەو گوڵە جوانانە کۆدەکەمەوە و سفرەی گەورەکەمی پێ دەڕازێنمەوە. ئەگەر تۆ ئاوا نەبوویتایە ئەوا ماڵی ئەوان ئەو گوڵە جوانانەی نەدەبوو.

لە ڕاستیدا هەر یەکەمان سەتڵێکی درزدارین. هەر یەکەمان کەموکورتی تایبەت بە خۆمانمان هەیە. دەبێت کەموکورتییەکانمان قبوڵ بکەین و سوودیان لێ وەربگرین، لە جیاتی ئەوەی لە خۆمان تووڕە ببین و لە خۆمان دووربکەوینەوە بەهۆی کەموکورتییەکانمانەوە. نابێت خۆمان بە کەم بزانین. لەوانەیە ئەو شتانەی کەسانیتر بە کەموکورتی دەزانن، موعیزەی ئێمە بن. دەبێت لەم دیدگایەوە سەیری بکەین.

## من چیم کردووه تا شایەنی ئەمە بم؟

لە ناخمدا بچووکترین خراپەش نەبوو بەرامبەر هیچ کەسێک. دەترسام لەوەی دڵیان بشکێنم، لەدەستیان بدەم و خەمباریان بکەم. هەرگیز وازم لە خۆشویستنی خەڵکی نەهێنا، هەرچەندە هەمیشە دەبووە هۆی خەمباربوونم. ئەوانیش وازیان نەدەهێنا لە خەمبارکردنی من، ماندووکردنم، شکاندنی دڵم و پەشیمانکردنەوەم. دواتریش تۆ هاتیتە سەر ڕێگام. خۆمدا بەدەست پێکەنینەکانتەوە و هاتیتە ناو ژیانمەوە. چاوەکانتم خۆشویست. ئەو ڕستانەم خۆشویست کە لە لێوەکانتەوە دەکەوتنە خوارەوە. هەموو ئەو شتانەم خۆشویست کە لە دوور و نزیکەوە پەیوەندیان بە تۆوە هەبوو. عەشق بوێرییە، سەرەڕای هەموو شتێک.

من متمانەم پێکردیت، هەرچەندە دەمزانی ئازارم دەدەیت. ئەی دواتر؟ هەموو ئەو شتانەت لە ناوبرد کە لە ناخمدا هەبوو بەرامبەرت. لە هەموو کەسێک جیاوازتربوویت بۆ من، بەڵام

تۆ خۆتت وەک هەموو کەسێکیتر لێکرد. لە کاتێکدا من گیانی خۆمم پێدەدایت تا دڵخۆشبیت تۆ هەموو شتێکت لەناوبرد. وە دواتر تێگەیشتم کە هەندێکجار خۆشویستن بەسنییە. هەرچەندە زۆربەی شتەکانیش بە ڕاستی بکەم بەڵام ئەوەی بیەوێت بڕوات هەر دەڕوات. مرۆڤ کە کەسێکی خۆشویست وادەزانێت ئەو کەسەش ئەمی خۆشدەوێت و ئێرە ڕێک ئەو شوێنەیە کە زۆربەمان هەڵەی تێدا دەکەین. هێندەی خۆشەویستییەکەت تۆیان خۆشناوێت. ئێستا متمانەم و نییەتی باشم بەرامبەر مرۆڤەکان وەلاناوە. بە بەردەوامی ئەم پرسیارە لە خۆم دەکەم؛ من چیم کردووە تا شایەنی ئەمە بم؟

**ڕۆژانێک دێت ئەوانەی وایانکرد بڵێم؛**
**"من شایەنی ئەمە نەبووم"،**
**بڵێن؛ "من شایەنی ئەمە بووم"، تەنها ئارام دەگرم.**

**مەولانا گوتویەتی:**

**"قەدرزانین ئەوە نییە کە ڕۆیشت بەدوایدا بگریت،**

**بەڵکو ئەوەیە کە لەلاتبوو بە توندی باوەشی پێدا بکەیت."**

قسەکەی چەند جوانە. بەڕاستی خەمخواردن و گریانمان دوای ئەو هەڵانەی بە ئەنقەست کردوومانن هیچ مانایەکی نییە. ئێمەی مرۆڤ بە گشتی لە جیاتی ئەوەی سەرنج بخەینە سەر ئەو شتانەی هەمانە و قەدریان بزانین، بە خراپی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکەین و هەرچییەکمان لەدەستبێت دەیکەین بۆ لەدەستدانیان. 'پابلۆ نێرودا' گوتەیەکی زۆر جوانی هەیە لەمبارەیەوە و دەڵێت: "مرۆڤ شێتی هەموو ئەو شتانەیە کە بەدەستی نەهێناوە، بێ منەتە لە هەموو ئەو شتانەی بەدەستیهێناوە".

ژیان کورتە، قەدری خۆشەویستەکانتان بزانن. چێژ لە هەموو ساتێکتان ببینن. بخۆن و بخۆنەوە، لەم ژیانەدا تەنها ئەو ڕۆژە خۆشانەتان بۆ دەمێنێتەوە کە لەگەڵ کەسە ئازیزەکانتاندا بەسەرتان بردووە بێ پلاندان، لە ئێستادا بژی و چێژی لێ وەربگرە. بە بیرکردنەوە لە داهاتووت ناحەقی بەرامبەر ئێستات

مەکە. کاتێک درەنگ کەوتن بۆ هەندێک شت ئیتر هیچتان لەدەست نایەت. بۆیە لە جیاتی ئەوەی بەدوایدا بگریت، کە لەلاتە باوەشی پیادا بکە. لووتبەرز مەبە، دڵی مەشکێنە. کەم بڵێ و زۆر گوێبگرە. دوا مەکەوە بۆ ئەو شت و کەسانەی هەتە و دەبێت قەدریان بزانیت.

**خواستی ئاوخواردنەوەتان**
**بەو پەرداخەی شکاندووتانە هەر تەواونەبوو.**

**"بەس لە من دووربێت،**
**جا ببێت بە سوڵتانی میسڕ-یش**
**بە خەیاڵمدا نایەت."**

کەسێکی باشیت، بەڵام نزادەکەم خودا وا لە کەس نەکات لە ڕووی سۆزدارییەوە پێویستی بە تۆ بێت. ڕێگەی بەرەو تۆ نەهێنێت. بەشی پێویست ئازاری منت دا، با کەسیتر ئەو ئازارە نەچێژێت. تۆ مرۆڤ پەشیمان دەکەیتەوە لەوەی هەر خۆشیویستوویت و هەمووی لە لووتییەوە دەردەهێنیتەوە. ئەو خۆشەویستی و دڵە وێران دەکەیت کە پێشکەشتکراوە. هەموو ئەو هەستانە تەواودەکەیت کە وا دەزانیت تەواونابێت و هەموو شتە جوانەکان لەناودەبەیت. ئەو کەسەت بێهەستکرد کە خۆشەویستی خۆشدەویست و دڵی پر هەستبوو، وات لێ کرد ئیتر هیچ کەسێکی خۆشنەوێت. خۆت وا دەردەخەیت کە کەسێکی هەستیاریت، بەڵام هەمووی درۆیە. تۆ ئەو کەسە نیت کە باست دەکرد. دەی بڵێ خۆشمدەوێیت و برۆ، تۆ حەزت لەمانەیە.



**تۆ کەسێکت لە خۆت دوورخستەوە کە**
**هێندە تۆی خۆشدەویست، کاتێک ئازاریشت دەدا**
**هەر دەیویست لەسەر شانی تۆ بگری.**
**من بەمانە هەڵناخەڵەتێم، چونکە تۆ بێ دڵیت.**

# ئیدانەی کەس مەکە

دایکم دەیگوت؛ "ئیدانەی کەس مەکە، ڕۆژێک دێت تۆش ئەوەت بەسەردادێت کە ئیدانەت کردووە". بەڕاستی وایە. مرۆڤ هەتا بەسەریدا نەیەت هەندێک شت نابینێت. ئەم ئامۆژگارییەم لێ وەربگرن؛ ئیدانەی کەس مەکەن. بە زمانتان کەس بریندار مەکەن. سەیرکە ئەم پەندە دەڵێ چی: برینی چەقۆ چاکدەبیتەوە بەڵام برینی زمان چاکنابێتەوە". بە زمانتان کەس بریندار مەکەن، چونکە دوایی ناتوانن سارێژی بکەن. ئەو وشانەی دەیڵێین ڕەنگدانەوەی بیرۆکەکانمان و هەستەکانمانە و دێنە سەر زمانمان. دەبێت بە باشی بیر لەو شتانە بکەینەوە کە دەیڵێین و لە دەممان دەردەچێت. دەبێت بزانین واتاکەی بەرەو کوێ دەڕوات، وا لە بەرامبەر دەکات هەست بە چی بکات و چەند زیانی پێ دەگەیەنێت. برینی زمان لە بیرینی جەستە ناچێت. چاکبوونەوەی زۆر قورسە. کەس لە خۆت بە زیاتر مەزانە. بەو هێزەی هەتە بەسەر کەسدا مەڕۆ. هەمیشە لەگەڵ کەسە زوڵملێکراو و بێهێزەکاندابە.

**حەزرەتی مەولانا بەم شێوەیە کورتی کردۆتەوە:**

**"ئەگەر بەندەیت ئەوا بەندایەتی خۆت بزانە و**

**خۆت بە سوڵتان مەزانە.**

**ئارەزووی دەریاوانی مەکە هەتا دەریا نەبینیت."**

## ژن دەڕوات، چونکە...

ژن خۆشەویستی ناکات تا بڕوات، بێ هۆکاریش ناڕوات. ژن کە دەڕوات دڵنیابە چەندین هۆکاری هەیە. ژن کاتێک ئەو پیاوەی خۆشدەوێت کە باوەڕی بە ڕاستگۆیی، نیەت باشی و میهرەبانییەکەی هەیە ئەوا زۆر جوان خۆشیدەوێت، زۆر جوانیش تێدەکۆشێت بۆ ئەو خۆشەیستییەی. بەڵام کە بینی ئیتر هیچ هۆکارێک نەماوە بۆ مانەوە لەلای ئەو پیاوە، ئەوا وەک ئەوەی هەرگیز خۆشینەویستبێت وازی لێ دەهێنێت و دەڕوات.

ژن دەڕوات، چونکە پێشتر زۆر هەوڵیداوە و بینیوێتی کە هیچ شتێک ناگۆڕێت. ژن کاتێک دەگاتە خاڵی ڕۆیشتن، پێیوایە ئیتر هیچ شتێک نەماوە کە لە دوای ئەو خاڵەوە پێی بکرێت. هەموو ژنێک هێشتا کەمێک لە منداڵی لە ناخیدا ماوەتەوە. کەسانی پێگەیشتوون، بەڵام لە هەمان کاتدا دڵێکی منداڵانەیان هەیە. گرنگینەدان بەو منداڵەی ناخیان هۆکارێکی ڕۆیشتنە بۆ ژنەکان.

ژن دەڕوات، لەبەر ئەوە نییە کە خۆشیناوێت، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە شایەنی نییە. ژن کاتێک بینی ئەو پیاوەی شەڕی بۆ کردووە لەگەڵ ئازارەکاندا و لەبەر ئەو خۆی خستۆتە ژێر

هەموو بارێکەوە، ئیتر شایەنی هیچ شتێک نییە، ئەوا لەو ساتەدا ئەو پیاوە بوونی نامێنێت لەلای.

ژن دەڕوات، هەرچەندە خۆشیشیبوێت. کە ڕۆیشت لەوانەیە دڵی بەجێبهێڵێت، بەڵام ئەقڵی لەگەڵ خۆیدا هەر دەبا. بیری دەکات، بەڵام ناڵێت بیری دەکەم. چونکە ئەقڵ و مەنتقی زاڵن بەسەر هەستەکانیدا.

ژن ئەو ساتەی هەستیکرد لە دڵەوە سەیری چاوەکانی ناکرێت، دەڕوات. ئەو ساتەی هەستیکرد درۆی لەگەڵدا دەکرێت دەڕوات. هەر وەک گوتم ژن کە ویستی بڕوات ئیتر ناتوانیت بیوەستێنیت. وا مەزانە کە خۆشیویستیت ئیتر ناڕوات، هەر دەڕوات. ئەوانەی وادەزانن هەرگیز وازتان لێ ناهێنن، ڕۆژێک وازتان لێ دەهێنن. وەک ئەوەی هەموو ئەمانە بەس نەبێت، هەندێکیان دەڕۆن و قژیشان دەبڕن.

ژن کە ڕۆیشت گۆرانییەکەی 'سێزان ئاکسو' دەڵێتەوە کە دەڵێت: "من لە ژیانی تۆ چوومە دەرەوە کوڕە. دەی با بزانم دەتوانیت جێگەم بە کەس پڕ بکەیتەوە".

**کاتێک ژن دەڕوات،**

**هەموو ئەوانەی لە دوای خۆی بەجێیدەهێڵێت هیچ مانایەکیان نامێنێت.**

## یادی خودا بکە

هەندێک ڕۆژ دێت کە لە گیانی خۆشت بێزاردەبیت. تاقەتی هەناسە دانیشت نامێنێت. هەست دەکەیت خۆشت لە ژیانی خۆتدا زیادەیت. هەندێک کات تەنها بۆ تەواوبوونی ڕۆژەکان و تێپەڕبوونی کات دەژیت. نە تامی خواردن دەکەیت نە خواردنەوە. لە ناکاو شتێک دەبێت. دواتر کۆمەڵێک شتیتر، کاتێک سەیردەکەیت یەک دونیا شت ڕوویانداوە و هەموو شتێک بە دوای یەکدا هاتووە. واتلێدێت ناتوانیت خۆت لەو دۆخە دەربهێنیت. وەک ئەوەی قورساییەکی گەورە هاتبێتە سەر سنگت و بۆماوەی چەندین ڕۆژ لەوێدا دەمێنیتەوە.

دوای ماوەیەک لەگەڵ ئەو قورساییەی سەر سنگیشت ڕادێیت. خۆت لە ناو ماندوێتییەکی هێندە سەخت و گەورەدا دەبینیتەوە کە هێزی هەنگاونانت بەرەو کەس نییە. دڵت تەنها خوێن دەنێرێت و هیچ کارێکیتر ناکات، هەوری بێ هەستی بەسەر سەرتدا دەسوڕێتەوە و هەست بە هیچ شتێک ناکەیت بەرامبەر بە هیچ کەسێک. هیچ شوێنێک و هیچ کەسێک نادۆزیتەوە تا بۆی بڕۆیت. دەتەوێت بەسی بکەیت، بەڵام بێدەنگ دەبیت. دەڵێیت تەواو ئەم جارە ناتوانم چاک ببمەوە، ناتوانم بێمەوە سەر پێی

خۆم. دواتر یادی خودا دەکەیت و هەموو کێشەکانت چارەسەر دەبن. لە بیری مەکە، لەو شوێنەی بەندە دەڵێت تیاچووم خودا دەڵێت فریاتکەوتم.



**"دەزانین دڵت تەنگ بووە."**

**(الحجر ٥١\٧٩)**

**"لەبەر خودا ئارامبگرە."**

**(المدثر ٤٧\٧)**

**"لەناو هەموو سەختییەکدا ئاسانییەک هەیە"**

**(الانشراح ٤٩\٥)**

# پێویستت بە هیچ کەسێک نییە

جگە لە خۆت پێویستت بە هیچ کەسێک نییە. دۆست قسەی ڕەقە، هەموو ئەوانەی دەڵێن؛ "لەلاتم" هەر قسەی زیادە دەکەن. بیر لە خراپترین ڕۆژت بکەرەوە، ئەو هەموو کەسەی گوتیان؛ "لەلاتم" بەڵام هەر بەتەنها تێتنەپەڕاند؟ بیری لێ بکەرەوە، هەر خۆت هەڵنەستایتەوە سەر پێ؟ دڵت پڕبوو، هەر بەتەنها نەگریایت؟ لێت دەپرسم؛ بەشی پێویست لەبەر کەسانێک ناحەقیت بەرامبەر خۆت نەکرد کە هەر شایەنی نین.

مرۆڤەکان دێن و دەڕۆن. ئەوە تۆیت کە دەمێنیتەوە. بۆیە باش ئاگاداری خۆتبە، لەبەر خۆت. هەموو کەسێک دەڕوات و لە کۆتاییدا خۆت بۆ خۆت دەمێنیتەوە. دەکەویت، هەر خۆت هەڵدەستیتەوە سەر پێ. بریندار دەبیت، هەر خۆت برینەکانت سارێژ دەکەیت. وەک هەموو کاتێک زۆر کەس دەڵێن؛ "لەلاتم" بەڵام هەر بەتەنها لەناو ئەو هەموو ئازارەوە دێیتە دەرەوە.

پێویستت بە باوەشێک دەبێت، بەڵام هەر خۆت باوەش بە خۆتدا دەکەیت. دەردەکانت دەتسوتێنن، بەڵام وەک باڵندەی فینێکس لە خۆڵەمێشەکانی خۆتەوە لەدایک دەبیتەوە. بەباشی ئاگاداری خۆت بە، تۆ لە هەموو کەسێک زیاتر پێویستت بە خۆتە.

**خودا کەسانێک بهێنێتە سەر ڕێگەت کە قەدرت بزانن.**

## بۆچی هەر ئێمە خەم دەخۆین؟

لەبەر ئـەوەی هەندێک شتمان قبوڵکرد و بێدەنگبووین لەسەریان کە کەسانیتر بە هیچ جۆرێک قبوڵی ناکەن. لەبەر ئەوەی چاوپۆشیمان لە هەندێک شت کرد کە قابیلی قبوڵکردن نەبوون. لەبەر ئەوەی لە هەندێک کەس خۆشبووین کەنەدەبوو لێیانخۆش ببین، متمانەمان بە کەسانێک کرد کە هیچ متمانەپێکراو نەبوون. چونکە سـەرەڕای ئـەوەی بە ئـازار و خراپە وەڵامی چاکەکانمان، خۆشەویستییەکانمان و متمانەکانمان درایـەوە ئێمە هەر نەمانتوانی بە کەس بڵێین نەخێر و سـەرەڕای ئەو خراپانەی بەرامبەرمان کرا ئێمە هەر وازمـان نەهێنا لە چاکە کردن. لەبەر ئەوەی مانامان بەخشی بە هەموو شتە بێ ماناکان. لەبەر ئـەوەی زۆر بیرمان لە کەسانی بێ باک کـردەوە، دڵی خۆمان کرد بە فیدای کەسانێکی بێ دڵ. لەبەر ئەوەی هەوڵماندا کەسانێک بەدەست بهێنین کە باکیان نەبوو بە لەدەستدانی ئێمە. لەبەر ئەوەی کاتێک ویستیان بڕۆن ئێمە پێمان گوتن بمێننەوە. لەبەر ئەوەی دووبارە لەو کەسانە خۆشبووین کە کاتێک ئێمە پارچە پارچە بووبووین ئەوانە وەک ئـەوەی هیچ نەبووبێت بەردەوامبوون لە ژیانی خۆیان.

باشە بۆچی کاتێک ئەوان دڵخۆشن ئێمە هەر خەم دەخۆین؟ با من پێتان بڵێم؛ هەتا ئاوا بەردەوامبین ئێمە هەر دەدۆڕێین. کاتێک ئەوان ژیانی خۆیان دەژین ئێمە هەر خۆمان خەمبار دەکەین.

**کە ئێوەمان خۆشویست بینیمان ئەنجامەکەی چی دەبێت.**
**بۆیە لەمە بەدواوە ئیتر تەنها خۆمانمان خۆشدەوێت.**

# ناسیاوم زۆرە، بەڵام بێ کەسم

زۆر کەسی پێویست و نا پێویستم ناسی. هەموویان خۆیان؛ جیاوازی، هاوشێوەیی، کوالیتی و بێ کوالیتی خۆیانیان دەرخست. بە هیچ شێوەیەک دەستم لە کاری کەسیانەوە وەرنەدا. هەوڵم نەدا بۆ گۆڕینی بیرۆکەی کەسیان لە بارەی منەوە. هەموویان چییان ویست ئەوەیان کرد. ڕێگریم لە کەس نەکرد لە کردنی ئەو شتەی خۆی دەیەوێت. ویستیان بێن و هاتن. ویستیان بڕۆن و ڕۆیشتن. من تەنها سەیرمکردن. دوای ماوەیەکیش بۆم دەرکەوت کە زۆر کەس دەناسم بەڵام بێکەسم. ئێستا کاتێک سەیرێکی ئەو کەسانە دەکەم کە قسەی زل زلیان بۆ دەکردم و بەڵێنیان پێ دەدام و هەرگیز جێبەجێیان نەدەکرد، دەبینم کە تەنها هیچێکی زۆر گەورەن. هەموویان تەنها هیچێکن و تەواو... بۆیەش ناسیاوم زۆرە بەڵام بێکەسم. تێرم لەو "لەلاتەم"ەی ئەو کەسانەی تەنها قسە دەکەن و هیچیان دیار نییە. ماوەیەکی زۆرە وازم لە هەموو کەسێک هێناوە، چی دەکەن با بیکەن. ئیتر گوێ بە هیچ شتێک نادەم.

**کاتێک هەبوو من لە لەدەستدانی تۆ دەترسام.**

**ئێستاش تۆ لە بێ منی بترسە.**

## ناتوانیت کەس ڕازی بکەیت

ناتوانیت کەس ڕازی بکەیت. هەرچییەکیان بۆ بکەیت هەر بە ناڕەزاییەوە دێنەوە بەر دەرگات، بۆیە خۆت ماندوو مەکە بە ڕازیکردنی کەسانیترەوە. واز لەو کەسانە بێنە کە شایەنی تۆ نین. بۆ خۆت بژی. بە خۆڕایی خۆت ماندوو مەکە. نەک هەر پاداشتی چاکەکانیشت نادەنەوە، بەڵکو تەنانەت سوپاسێکیشت ناکەن. هەر قەدرت نازانن. بەردەوام داوای زیاترت لێ دەکەن. چونکە چاویان بە هیچ تێرنابێت. بە کورتییەکەی دەڵێم هەوڵ بۆ کەسێک مەدە کە لە لەدەستدانی تۆ ناترسێت، هەر لە جێی خۆیەوە دانیشتووە و قسە دەکات و هیچت بۆ ناکات، بەهات پێ نادات و هیچ مانایەکت نییە لەلای. هەوڵ مەدە ڕازییان بکەیت. ئەم ناحەقییە بەرامبەر خۆت مەکە. هەر کەسێک چی پێ دایت تۆش ئەوەی پێ بدەرەوە. لەوە زیاتری پێ مەدە. سەیرکی ئەم وتەیەی 'ولیام شکسپیر' بکە چەند جوانە: "ئەمە مرۆڤە ئیتر. دەڵێت بارانم خۆشدەوێت، بەڵام چەتر هەڵدەگرێت. دەڵێت خۆرم خۆشدەوێت، بەڵام ڕادەکاتە سێبەرەکەوە. دەڵێت بام خۆشدەوێت، بەڵام پەنجەرەکانی دادەخات." تۆ پێم بڵێ گیانی من، فیداکاری بۆ کەسانی بێ وەفا بکەیت بە کەڵکی چی دێت؟



**پێم باشە ئەم وتانەی**
**حەزرەتی مەولاتان بیربخەمەوە:**
**"بە خۆڕایی خۆت ماندوو مەکە. تەنها هێندەی ئەو شتانەی**
**دەیبینن و دەیبیستن لێت تێدەگەن.**
**تەنها ئەو شتانەش دەبینن کە خۆیان لێی تێدەگەن".**

# ئەو ڕێگایانە بۆ هاتنەوەشتن

ڕابردووم پڕە لەو کەسانەی هاتن و وایان لێکردم وابزانم هەرگیز ناڕۆن، منیان پەیوەستی خۆیان کرد و دواتر لە ناکاو دیارنەمان. هەر کەسێک زانیبێتی خۆشمدەوێت لە یەکەم شەڕماندا پشتی تێکردم و ڕۆیشت. کەس نەبوو ئەو بێ چارەییەی ناو دڵم نەهێڵێت. دڵم شکاوە لەوانەی دەیانگوت؛ "هەرگیز ناڕۆم" و یەکەم کار کە کردیان ڕۆیشتن بوو. خۆشەویستم، دەزانیت ئەو ڕێگایانە تەنها بۆ ڕۆیشتنت نین، بۆ هاتنەوەشتن بۆلام. بەڵام تۆ هەر ڕۆیشتیت... منیش مامەوە، ئازارم چەشت، خوێنم لێ ڕژا و هەڵتخەڵەتاندم. کاتێک لەسەر ئەو ڕێگەیەی بەرەو من دێت چاوەڕێم دەکردیت، فێرت کردم واز بهێنم، فێرت کردم نابێت جارێکیتر متمانە بە کەس بکەم... و فێرت کردم جارێکیتر کەسم خۆشنەوێت.

**بە ئازارترین شت ئەوەیە ئەو کەسانەی**
**لە هەموو کەسێک زیاتر هەوڵت بۆداون**
**تۆیان خۆشنەوێت...**

## ئەو ئیشانە ئاوا نیە ئیتر

جارێکیان 'جان یوجێل' گوتویەتی: هێندەی خۆشەویستییەکەت خۆشدەویسترێیت". نازانم کەستان هێندەی خۆشەویستییەکەتان خۆشویستراون یان نا، بەڵام من هەرگیز هێندەی خۆشەویستییەکەم خۆشنەویستراوم. واز لەوە بێنە هێندەی خۆشەویستییەکەم خۆشبویسترێم، بگرە بە ئازار وەڵامی هەستەکانم درایەوە، وەک ئەوەی خراپییەکی زۆر گەورەم بەرامبەر ئەو کەسە کردبێت. هەرچەندە جگە لە خۆشویستن هیچیترم نەکردبوو. بۆ نموونە هەرگیز کەس لە لەدەستدانی من نەترساوە، هەر من لە لەدەستدانی ئەوان ترسام. عاشقی دوو کەسبووم و هەر من ئەو کەسەبووم کە عاشقتربوو. هەتا ئێستاش کەسم نەبینیوە هێندەی خۆشەویستییەکەی خۆشبویسترێت.

بە ڕای من هەرگیز هێندەی خۆشەویستییەکەت خۆشناویسترێیت. تۆ بەردەوام هەوڵدەدەیت، فیداکاری بۆ دەکەیت و تێدەکۆشیت. ئەی ئەو چی دەکات؟ هیچێکی زۆر گەورە. دڵی تۆ هێندەی چۆلەکەیەک دەبێت، بەڵام بۆ ئەو هێندەی ئاسمان هەستی تێدا جێگە دەکەیتەوە. بەڵام ئەو هەرگیز قەدری ئەمە نازانێت. بۆیە دەڵێم مرۆڤ هەرگیز هێندەی خۆشەویستییەکەی خۆشناویسترێت.

**دڵێکی عاشق،**
**ئەگەر خۆشیش نەویسترێت هێندە بە ئاسانی کۆڵنادات**
**کەسی عاشق ناڕوات، ناتوانێت بڕوات،**
**ئەمە سەرەکیترین یاسای خۆشەویستییە.**

**وتەکەی پەیامی سافا هەیە کە دەڵێت:**
**"کەسە باشەکان نادۆڕێن، بەڵکو کەسانیتر ئەوان دەدۆڕێنن." من ئارام دەکاتەوە.**

هەرچەندە منت خۆشنەویست، بەڵام من هەر کەمێک زۆرم لێ کردی. هەموو جارێک ئێمەت لەو شوێنەوە شکاندەوە کە چاکم کردبوەوە. ئەو هەموو شتەت پشتگوێخست کە بۆم کردیت. ئەو کەسەت لەناوبرد کە بە خەمباربوونت خەمی دەخوارد، بە دڵخۆشبوونت دڵخۆش دەبوو. چەندین جار قسەم لەگەڵ کردیت. وا دەرتدەخست کە تێگەیشتوویت، بەڵام ئەنجامەکەی هەر نەدەگۆڕا. تۆ هەر ڕۆیشتیت. سەرەڕای هەموو ئەمانە هەموو شتێکی تۆم قبوڵکردبوو. هاتنت، ڕۆیشتنت، خۆشنەویستن و پشتگوێخستنت... هەمووشتێکت. دوای ماوەیەک سەیرم کرد ئاوا سەر ناگرێت، ئیتر منیش وازم هێنا لە هەوڵدان. بینیم تەنها

منم خۆم دەخەمە ژێر بارەوە، بۆیە وازم هێنا. بینیم هەموو ئەو شتانە پشتگوێ دەخەیت کە بۆتی دەکەم، بۆیە منیش ئێمەم نەهێشت. بەڵام ناخم ئاسوودەیە. خۆم داوە بە دەستەوە بۆ ئەو ڕستەیەی دەڵێت؛ "کەسە باشەکان نادۆڕێن بەڵکو کەسانیتر ئەوان دەدۆڕێنن". من هیچم نەماوە تا بیدۆڕێنم. تۆ منت دۆڕاند.

**لەو قۆناغەدام کە بە متمانە نەکردن بە کەس**
**چارەسەری کێشەی بێ متمانەییم کردووە.**
**وازم لێ بێنن، ئیتر لەخۆم دەبم.**

## "پیاوان ژنە جوانەکانیان خۆشدەوێت؛ بەڵام ژنەکان ئەو پیاوانە بە قۆز دەبینن کە خۆشیاندەوێت".

ولیام گۆڵدینگ

هەموو دەزانین کە واتای وشەی جوانی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکیتر دەگۆڕێت. پیاوەکان هەمیشە دەیانەوێت ژنێکی جوان بهێننە ژیانیانەوە. بەڵام نازانن کە دەبێت سەرەتا ئەو ژنەیان بە جوانی خۆشبوێت. بەڵام ژنان ئاوا نین. پیاوان زیاتر سەرنج دەخەنە سەر ئەنجامەکان، بەڵام ژنان گرنگی بە وردەکارییەکان دەدەن. واتە زیاتر گرنگی بە هەستەکان دەدەن.

ژنێک کاتێک پیاوێکی خۆشدەوێت چاوی بەرامبەر هەموو پیاوەکانیتر کوێر دەبێت. وە ژنێک کە پیاوێکی خۆشویست ئەوا ئەو پیاوە دەبێتە قۆزترین کەسی ژیانی. واتا 'ولیام گۆلدینگ' زۆر ڕاست دەکات. پیاو ژنی جوانی خۆشدەوێت، بەڵام ژن کە پیاوێکی خۆشویست بە جوانی خۆشیدەوێت، وە هەموو هەستەکانی پێشکەش بەو دەکات.

## ژنان خەمبار مەکەن.
## دواتر وا دەزانن پیاوان بە کەڵکی هیچ نایەن
## جگە لە پەردە هەڵواسین.

تۆڵستۆی لە وەڵامی پرسیاری؛
"چۆن دڵخۆش دەبین؟"دا دەڵێت:
"بە دڵخۆشبوون بۆ ئەو شتانەی هەمانە،
خەم نەخواردن بۆ ئەو شتانەی نیمانە."

لە کاتێکدا ئەو هەناسەیەی هەڵیشی دەمژین سپاردەیە لەلامان، خەم بۆ ئەو شتانە دەخۆین کە نیمانە و قەدری ئەو شتانە نازانین کە هەمانە. لە ڕاستیدا بۆ گەیشتن بە دڵخۆشی دەبێت قەدری ئەو شتانە بزانین کە هەمانە و سوپاسگوزاربین، بەڵام ئێمە نایزانین. ئەم هەموو کاتە هەر لە خۆمان پرسی؛ "تۆبڵێی ڕۆژێک ئێمەش دڵخۆش ببین؟" کاتێک بیرملێکردەوە بۆم دەرکەوت دڵخۆشی لەو شتانەدا نییە کە هەوڵ دەدەین بەدەستی بهێنین، بەڵکو لەو شتانەدایە کە هەمانە. 'ڤلادیمیر نابۆکۆ' بەم شێوەیە هاوکێشەی دڵخۆشی کورتکردوەتەوە: "ئەو کەسە دڵخۆش نییە کە خاوەنی باسترین شتەکانە، بەڵکو ئەو کەسەی چێژ لەو شتانە وەردەگرێت کە هەیەتی، دڵخۆشە".

'ولیام شکسپیر'یش بەم شێوەیە باسی خەمباری کردووە: "لەبەر ئەوەی کاتێک هەوڵت دەدا بۆ بەدەستهێنانی ئەو شتانەی نیتە، ئەو شتانەت لەیاد کردووە کە هەتە، خەمباریت". دڵخۆشبوون و خەمباربوونیش بە تەواوی لە دەستی ئێمەدایە. هەروەک دەیبینن هاوکێشەکەی زۆر ئاسانە. قەدری ئەو شتانە دەزانین کە هەمانە و لە یادیان ناکەین و سوپاسگوزار دەبین. خۆشمان خەمبار ناکەین بۆ ئەو شتانەی نیمانە. هەر ئەوەندەیە.

**هەندێک دڵخۆشیم هەیە،**
**کە تەمەنیان هێندەی تەمەنی پەپولەیەکە.**

## وازم لەو کەسانە هێنا
## کە وایاندەزانی ناتوانم وازیان لێ بهێنم

بتوانن واز لەو کەسانە بهێنن کە هیچ سوودێکیان نییە بۆتان و هەر قەرەباڵغییەکی بێ مانا دروست دەکەن. دەپرسم؛ ئاخۆ گرنگی ئەو کەسانەی نە دڵخۆشیتان و نە ئازارتان بە هی خۆی نازانێت، چییە لە ژیانتاندا؟ واتایان چییە؟ هیچ. بە پێچەوانەوە هەر دەبنە بار بەسەرتەوە. ئێستا کە سەیردەکەم دەبینم چەند کەسی بێ مانام هێناوەتە ژیانمەوە. کەسانێکم هێناوەتە ژیانمەوە کە هیچ سوودێکیان بۆ من نەبووە، تەنها دەبوو خۆم بە بەهێز دەربخەم لەلایان، ناچاربووم خۆمیان لێ بپارێزم و لە هەمووشی گرنگتر هیچ سوودێکیان بۆ ژیانم نەبوو و تەنها کاتبەفیڕۆدان بوون.

مرۆڤ زۆربەی کات پێویستی بە کەسێکە کە لەلای ئەو وا هەستبکات لە ماڵی خۆیەتی و پێویست نەکات خۆی بە بەهێز دەربخات لەلای. بەڵام ئیتر من لەم نەخۆشییە ڕزگارم بوو. وازم لەو کەسانە هێنا کە وایاندەزانی ناتوانم وازیان لێ بهێنم، وایاندەزانی لەسەر شاخی قاف-ن... هیچ مانایەکیشیان

نەبوو... ڕزگارم بوو لەو بارە ناپێویستانە. ڕزگارم بوو لەوانەی هاوبەشی هیچ یادەوەرییەکم نین لە ژیانمدا و سەرەڕای ئەوەش بێڕووانە دەڵێن؛ "بۆچی هیچ هەواڵمان ناپرسیت؟" با ئەو کەسانە لە ژیانتاندا بمێننەوە کە پێویستتانن و ڕێگاش بۆ ئەوانەی تر بکەنەوە.



**با ئەو کەسانەی خۆشەویستی دەزانن**
**برسێتی دڵتان بۆ خۆشەویستی تێر بکەن.**

## ناترسم لە لەدەستدانی ئەو کەسانەی شایەنی من نین

ئیتر ماندووبووم لەو پەیوەندیانەی تەنها بەهۆی فیداکارییەکانی منەوە بەردەوامە، لەو کەسانەی بوێرییان نییە بڵێن؛ "ئیتر تەواوبوو" و دەڕۆن، ماندووبووم لەو پێکەنینانەی لە پشتییانەوە نییەتی خراپ خۆی حەشارداوە. من بێجگە لە خۆشەویستی بیر لە هیچیتر ناکەمەوە، ئەگەر بشمەوێت ناتوانم خراپە بەرامبەر هیچ کەسێک بکەم و هەرچییەک ببێت هەرگیز لەو ڕێگەیە لانادەم کە بەڕاستی دەزانم. بەڵێ قبوڵی دەکەم، ئیتر ناتوانم مرۆڤەکان بناسمەوە، وە ئیتر لەو شتانە خۆشنابم کە بەرامبەرم کراوە. کۆمەڵێک دیوارم هەیە کە ئێستا پێیان دەگوترێت تەنهایی. هەندێک خەیاڵی نیوە ناچڵم هەیە و هەندێک نزام هەیە کە بەردەوام لەسەر دەممن.

لەو ڕۆژەوەی فێربووم باوەش بە خۆمدا بکەم نازی کەس هەڵناگرم. ئیتر هەوڵ نادەم شتە شکاوەکان چاک بکەمەوە. کێ شایەنی چییە با دوای ئەوە بکەوێت. ئەوەی مەیلی ڕۆیشتنی

هەبێت، پێشی بڵێیت بمێنەرەوە هیچ سوودی نابێت. ناتوانم خۆم بۆ کەسێک ماندوو بکەم کە شایەنی نییە. منیش گوناحم.

نامەوێت بەهایان پێ بدەم و بێ بەها بم. نامەوێت خۆشمبوێن و خۆشیاننەوێم. ئێوە بەمە بڵێن بێ هەستی، منیش پێی دەڵێم وازهێنان. من ڕازیم لە دۆخی خۆم. لە ناو تەنهایی خۆمدا بخنکێم باشترە لەو خۆشەویستییانەی دەرینابڕن بۆم.

**من وازم لەو کەسانە هێنا کە**
**لە لەدەستدانی من نەدەترسان.**

**"خۆپەرستی وەک ئەوەیە**
**ئاوێنەیەک بە چاودا هەڵبواسرێت.**
**ئەو چاوە سەیری هەر شوێنێک بکات،**
**جگە لە خۆی کەسیتر نابینێت."**

حەزرەتی مەولانا

هەموو کەسێک ڕێگایەکی خۆی هەیە. بیرۆکە و ڕاستی خۆی هەیە کە لە سەریان دەکاتەوە. کەس بۆ ساتێکیش هەوڵ نادات لە بەرامبەرەکەی تێبگات. هەموو کەسێک چەند شتێک دەزانن و کەس لەوانە لانادات. هەموو کەسێک ئەوە تێدەگات

خۆی دەیەوێت. هەموو کەس ئەوە دەبینێت کە دەیەوێت بیبینێت و گوێ لەوە دەگرێت کە دەیەوێت بیبیستێت. واتە بە کورتییەکەی هەموو کەس ئەوە دەکات کە لە بەرژەوەندی خۆیدایە. هەر کەسە سازێکی گرتووە بەدەستییەوە و بۆخۆی گۆرانی دەڵێت.

پێشتر شەڕم لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەکرد کە ناحەقییان هەم بەرامبەر من دەکرد هەم بەرامبەر خۆیان. لە ڕاستیدا هەوڵم دەدا باسی ئەو شتانە بۆ خەڵکی بکەم کە باوەڕم پێیان بوو. بینیم کاتێک هەوڵم دەدا خەڵکی تێبگەیەنم و دەمگوت؛ "سەیرکە ئەمە ئاوا نییە. وەک ئەوە نییە کە بیری لێ دەکەیتەوە، لە ڕاستیدا ئاوایە." ناحەقییەکی زۆر گەورەم بەرامبەر خۆم دەکرد. ئەو کاتە تێگەیشتم کە نابێت هەوڵ بدەم بۆ ڕاستکرنەوەی ئەو هەڵانەی بە ڕاستی دەزانن. ئەوکاتە تێگەیشتم کە گوناحە دەمی خۆم هیلاک بکەم بۆ تێگەیاندنی ئەو کەسانە و دەبێت وازیان لێ بهێنم وەک خۆیان بمێننەوە. ئیتر هەوڵ نادەم کەس تێبگەیەنم. وازم لە هەموو کەس هێناوە، چیان لێ دێت با لێیان بێت.

ئیتر ناتوانم بەرگەی ئەو کەسە بگرم کە تەنها لە پەنجەرەی خۆیەوە سەیری ڕووداوەکان دەکات، نە دەزانێت گوێبگرێت، نە تێدەگات، نە هەوڵ دەدات تێبگات، هەرگیز ناهێڵێت ڕەخنەی لێ بگریت، بیرۆکەکانی نەگۆڕن، لە هەموو بابەتێکدا خۆی بە لەسەر حەق دەزانێت و ناتوانن داوای لێبوردن بکەن، بە کورتییەکەی ناتوانم بەرگەی کەسانی خۆپەرست بگرم. لە دونیادا هیچ شتێک نییە لەم جۆرە کەسانە زیاتر ڕقم لێیبێت.

نەک هەر ئەو کەسانە مەهێننە ژیانتانەوە، بەڵکو تەنانەت هەوڵیش مەدەن ئەو دیوارە ئەستورانە بڕوخێنن کە بەرامبەر ئێوە هەڵیان چنیوە. خۆتان ماندوو مەکەن و هەناسەتان بە فیڕۆ مەدەن بە ئومێدی ئەوەی تێبگات لێت. چونکە تێناگەن. دادەنیشیت باسی چی بۆ کەسێک دەکەیت کە لە هیچ تێناگات؟ باسی مەکەن، لە دڵی خۆتاندا بیهێڵنەوە، با خەریک بێت دڵیشتان بتەقێتەوە، هەر باسی مەکەن. هیچ نەبێت دواتر نالێیت؛ "هەوڵمدا تێیبگەیەنم بەڵام تێنەگەیشت".

**لەسەر سنورێکی باریکی نێوان**
**هەوڵدان بۆ هەموو شتێک و واز هێنان لە هەموو شتێکدام.**
**ئێوە ناتوانن بزانن ئەمە واتای چییە.**

## "دونیا جەهەننەمێکە بۆ دڵە ناسکەکان."

گۆتە

هەمیشە بە قورسی سزادرام لەسەر هەست ناسکیم. لە هەموو بوارێکی ژیانمدا دوای هەستەکانم کەوتم. زۆر کات پرسیارم لە خۆم کردووە کە ئایا مەنتق هەڵبژێرم یان هەستەکانم، بەڵام هەرگیز مەنتقم هەڵنەبژاردووە. هەموو کاتێک هەستەکانم هەڵبژاردووە، هەرچەندە دەشمزانی هەر دەدۆڕێم.

لەبەر ئەمەشە من هەموو جارێک دۆڕام. چونکە بە جوانی خۆشمویستووە، خراپەم بۆ کەس نەبووە. هەمیشە گرنگیم بە کەسە بێباکەکان دەدا. وامدەزانی هەموو کەس وەک خۆمە. ڕێک لێرەدا هەستم بە ئازار کرد.

من هەموو نییەتە باشەکانم لەو ڕێگایانەدا تەواوکرد کە بە چاکەوە بەرەو کەسەکان دەڕۆیشتم. دونیا و خەڵکی جەهەننەمێکی پڕ ئاگرن بۆ دڵە ناسکەکان. زۆ درەنگ بەمەم زانی.

'سەباح الدین علی' چەند جوان کورتی کردوەتەوە:

**"هەرچەندە بێڕێزیشم بەرامبەر کرابێت، بەڵام**

**هەر بێڕێزیم بەرامبەر کەس نەکرد.**

**هەرچەندە نێوانمان باش نەبێت، بەڵام کاتێک زانیم کەسێک پێویستی بە منە، بێ بیرکردنەوە دەڕۆم بۆلای.**

**بەڵام بینیم کەسانێک هەیە کە خۆشەویستی،**

**ڕێز و تەنانەت میهرەبانیش چاکیان ناکاتەوە."**

## تۆ شایەنی من نیت

ئێستا خەم بۆ ئەوە دەخۆم گوێم لەو کەسانە نەگرت کە کاتی خۆی پێیان دەگوتم ئەو شایەنی تۆ نییە. بەهۆی تۆوە ئێستا ناتوانم سەیری دەموچاوی ئەو کەسانە بکەم. دەزانیت بەس وابیرم نەدەکردەوە کە تۆ شایەنی من نیت؟ گوتم نەخێر ئەو شایەنی هەموو شتێکی منە. هەرچییەکم کردبێت لەبەر ئەوە کردوومە کە خۆم دابوو بەدەست خۆشەویستیمەوە بۆ تۆ و وامدەزانی تۆ شایەنی منیت. هەرچەندە ئازاریشم چەشتبایە، هەر خۆشەویستیم بۆ تۆ دەخستە سەر برینەکانم.

کەڕبووبووم بەرامبەر هەموو ئەو کەسانەی پێیان دەگوتم کە شایەنی من نیت. گوێم لە هیچیان نەگرت.

هەر ڕامکرد لەو ڕاستییەی تۆ شایەنی من نیت. من هەر ڕامدەکرد و لێی و تۆش هەر دەتهێنایەوە بەردەمم. هەتا سەر ئێستان ئازارت دام. دڵێکت شکاند کە تۆی خۆشدەویست. نزای خراپت لێ ناکەم. زۆرم ناوێت، هەر ئەوەندەت بەسەردا بێتەوە کە بەسەر مندا هێنات بەسە بۆ من.

**'نەشئەد ئێرشاد' چەند جوان ئازارەکانی منی کورتکردوەتەوە:**

**"وامزانی بۆ هەتا هەتایە تۆ هی منیت..."**

## مرۆڤ هەمیشە پێویستی بە مرۆڤە

لە هەموو بەشەکانی ژیاندا و لە هەموو ساتێکدا مرۆڤ پێویستی بە مرۆڤە... هەموومان هەمان ژیان دەژین، کێشەکانمان هاوشێوەن و هەموومان ڕێبواری هەمان ڕێگەین. نە ئەو کارەی دەیکەین، نە پلە و پۆستمان و نە زۆری ئەو برە پارەیەی ناو گیرفانمان ناتوانێت لەیەکمان جیا بکەنەوە. بۆیە بەرامبەر کەس لووتبەرز مەبن. خۆت بە گەورەتر مەزانە لە کەس. زۆری پارەتان و باشی دۆخی داراییتان بە بەراورد بە کەسانیتر بە واتای ئەوە نایەت کە لووتبەرزبن بەرامبەریان و فیزیان بەسەردا لێبدەن.

'موحسین ئونلو' دەڵێت: "مرۆڤ بێ دەسەڵاتە، موحتاجە؛ بۆیە نابێت زۆر خۆی بە شت بزانێت". دەمەوێت باسی چیرۆکێکتان بۆ بکەم لەم بارەیەوە کە لە مەسنەوی-دا باسکراوە؛

ڕۆژێکیان زانایەکی ڕێزمان بە مەبەستی گەشت کردن دەچێتە ناو بەلەمێکەوە. ئەم پیاوە زۆر خۆی بەدڵە. جگە لە خۆی کەسی بەدڵ نییە. لەو کاتەدا دەریاوانی ناو بەلەمەکەی بە کەم دەبینی و وایدەزانی پیاوێکی سادەیە، و لێی پرسی:

"تۆ هیچت لەبارەی ڕێزمانەوە خوێندوەتەوە؟"

دەریاوانەکە هەموو تەمەنی لە دەریادا بەسەر بردبوو. تەنها ئەو زانیارییانەی دەزانی کە لەبارەی پیشەکەیەوە بوون. هیچ

پێویستی بە زانیارییەک نەبوو کە هیچ سوودێکی بۆ ئەم کارەی نابێت.

گوتی: "نەخێر نەمخوێندوەتەوە".

زاناکە گوتی: " ئەگەر وابێت ئەوا نیوەی تەمەنت بەهەدەر چووە".

ئەم قسانە زۆر ئازاری دەریاوانەکەیدا و دڵی شکا. زانای ڕێزمانەکە پێی دەگوت نـەزان و سوکایەتی پێدەکرد. بەڵام دەریاوانەکە بێدەنگبوو و هیچ وەڵامێکی نەدایەوە.

لەم کەین و بەینەدا ڕەشەبایەکی بەهێز بەلەمەکەی خستە ناو گەردەلوولێکەوە. دەریاوانەکە ئەو هەلەی دەستکەوت کە چاوەڕێی بوو.

بانگی زاناکەی کرد و گوتی:

"مەلە دەزانیت؟"

زاناکە بەم شێوەیە وەڵامی ئەم پرسیارەی دایەوە:

"نایزانم، من بەهرەی لەو جۆرەم نییە".

دەریاوانەکە گوتی:

"ئەگەر وابێت ئەوا ئێستا هەموو تەمەنی تۆ بەهەدەر چوو. چونکە کەمێکیتر ئەم بەلەمە نوقوم دەبێت. با زانیاریەکانی ڕێزمان بێن و ڕزگارت بکەن. بزانین چۆن ڕزگارت دەکەن..."

## کەس نییە نەتوانین وازی لێ بهێنین

کەسێک ئەگەر دەتوانێت بەبێ تۆ بەردەوام بێت لە ژیانی، وەک ئەوەی هەرگیز تۆی نەناسیبێت و تۆ نەچووبێتیتە ژیانییەوە بە ڕێی خۆیدا دەڕوات، ئەوا تۆش دەتوانیت بەردەوام بیت لە ژیانت و بەڕێی خۆتدا بڕۆیت. ناچار نیت پرسە بۆ کەس دابنێیت. مەڵێ ئاخر ناکرێت، ئەگەر نا ئەوا زۆر زیاتر خەم دەخۆیت. ئەو کەسە لە ژیانت دەربکە کە بێتۆیی هەڵبژاردووە. هەوڵ مەدە پەیوەست ببیتەوە بەو کەسەی وازی لە تۆ هێناوە. هیچ شتێک بۆ کەس مەکەن کە ناچار نین بیکەن. وازی لێ بهێنن هەر کەسێک لە کوێ دڵخۆشە با لەوێبێت. لە کاتێکدا ئەوان لەلای خەڵکیتر پشوو دەدەن، ئێوە خۆتان بۆ کەسانێک ماندوو مەکەن کە هیچ شایەنی نین.

زیاتر لەوەی شایەنیەتی هیچ شتێک بۆ هیچ کەسێک مەکەن. لەبیری مەکەن، ئەگەر ئەوان بتوانن بەبێ ئێوە بژین، ئەوا ئێوەش دەتوانن. با کەس وا نەزانێت ناتوانن وازی لێبهێنن. مرۆڤ دوای ماوەیەک هێندە پڕ دەبێت کە ئیتر واز لە خۆشی دەهێنێت. با کەس ئەمە لە یاد نەکات.

'فریدا کاهلۆ' دەڵێت:

**"بە وازهێنان لێیان دەتوانیت ڕزگارت ببێت لەوانەی بە هەوڵدان بۆت چاکنەکراوەتەوە."**

## با ویژدانت لێت خۆشبێت

دەڵێم با ویژدانت لێت خۆش ببێت، بەڵام نازانم چۆن داوای لێخۆشبوون لە ویژدانێک دەکەیت کە نیتە و ویژدانێک کە بوونی نییە چۆن لێت خۆش دەبێت. ئەگەر ویژدانت هەبووایە ئەوا دڵی کەسێکت نەدەشکاند کە هێندە بە جوانی و تایبەتی تۆی خۆشویستووە. هێندە هەوڵت نەدەدا بۆ لەدەستدانی و ساردکردنەوەی لە خۆت. دڵیت نەدەشکاند، ماندووت نەدەکرد و تێکتنەدەشکاند. ئەو شتانەی هەرگیز گرنگ نەبوون بۆ تۆ گرنگترین شتبوون لەلای من. بۆچی؟ چونکە تۆیان تێدابوویت. من هەموو ئەو شتانەم خۆشویست کە تۆی تێدابوو. ئێستاش بە قورسترین شێوە سزا دەدرێم لەسەری. ئەها 'یلدز تیلبێ' لە گۆنییەکیدا دەڵێت: "بە ئاگری ناو دڵمەوە وازم لێت هێنا، بە قورسی سزای خۆشویستنی تۆ وەردەگرم..."

**ئەگەر ڕۆژێک دڵت شکا، خەمباریان کردیت،**
**لە لایەنە لاوازەکەیان دایت، ئەوا با منت بیربێتەوە.**
**ڕۆژێک هەبوو تۆش ئەمانەت بە من کرد.**
**لەو ساتەدا دێمەوە خەیاڵت.**

## هیوادارم ڕۆژێک کەسێکی وا بێتە ژیانتەوە کە...

وات لێ بکات بڵێیت "شایەنی هەموو ئەو ئازارانەبوو کە چەشتم". هێندەی خۆشییەکانت ئازارەکانیشتی خۆشبوێت. وات لێ بکات هەستبکەیت لە تۆ زیاتر خۆشیدەوێیت. هەرگیز پەشیمانت نەکاتەوە لەوەی خۆشتویستووە و متمانەت پێ کردووە. هەرگیز تۆ بەجێنەهێڵێت.

بەڵام نەکەی بڵێیت "کەسی وا نییە". لەبیری مەکە، بیر لە چی بکەیتەوە ئەوە بەرەو خۆت ڕادەکێشیت. وە دووبارە لەبیری مەکە، تۆ کاتێک جوانیت کە واز لە ئومێدەکانت و نیەتە باشەکانت ناهێنیت و سەرەڕای هەموو شتێت لەو ڕێگەیە لانادەیت کە بەڕاستی دەزانیت. ئارامبگرە و بیبینە. لە ئەنجامی ئارامگیریدا لە داهاتوویەکی نزیکدا هەموو ئەو شتانە بەدەست دەهێنیت کە چاوەڕێت دەکردن و دەستت دەکردەوە و نزات بۆ دەکردن. ڕۆژێک دێت لە بارەی ئەو ڕووداوانەی زۆر خۆتت بۆ خەمبار کردووە دەڵێیت "من خەمم بۆ ئەمە خواردووە؟" و بە خۆت پێدەکەنیت.

## بسوتێ و بەرگەبگرە.

ئەگەر کەسیش گویی لێت نەبێت، کەسێک هەیە گوێی لە دەنگتە.

ڕۆژێک دێت گوڵەکانی تۆش بگەشێنەوە.

ئەوەندە بەسە تۆ باوەڕت بەو هەبێت. بەرگە بگرە، مۆعجیزەکان بە ڕێگاوەن.

**نسیب بە ڕوونی خۆی دەردەخات،**
**نیشانەی پرسیارت لەلا دروست ناکات.**

بیر لە کاغەزێکی سپی بکەرەوە، ئەوە تۆیت. قەڵەمێکیشت بەدەستەوەیە کە نانووسێت، ئەوەش مرۆڤەکانە. هەندێک مرۆڤ لەو قەڵەمە دەچن. چەند هەوڵبدەین بۆ نووسینی کاغەزەکە ئەوەندە زیانی لێ دەدەیت.

واتە زیان لە تۆ دەدات. هیچ پێویست ناکات شوختی بێ مانا لەسەر پەڕەیەکی سپی درووست بکەیت. ئەگەر نانووسێت ئەوا وازی لێ بێنە، با نەینووسێت. بۆچی ئەو کاغەزەی چیرۆکی جوانی لەسەر دەنووسیت بە شوێنەواری قەڵەمێکی بێسوود

پڕیدەکەیتەوە کە هەر ناشنووسێت؟ بە بەتاڵی بمێنێتەوە باشترە. کە کاتی خۆی هات چیرۆکی تۆ بە جوانترین شێوە و لە لایەن جوانترین قەڵەمەوە دەنووسرێت، ئارامبگرە.

سەری ئەو قەڵەمە بنێرەوە کە نانووسێت و فڕێیبدەرە سەتڵی زبڵەکەوە. بەسە هەوڵ مەدە ئازاری خۆت بدەیت کە دەشزانیت ئەو شایەنی تەنەکەی زبڵەکەیە. کەس لە خۆت بە گرنگتر مەزانە. خۆشەویستی بە زۆر نابێت. دەبێت لە ناخەوە هەڵبقوڵێت. لە دڵەوە بێت. بەڵام ئەگەر ئامەنە هیچیان نییە ئەوا چاوەڕێی هیچ لەو کەسە مەکە. چونکە ئەو کەسەی دڵی نییە لە هەموو کەس زیاتر زیانت پێ دەگەیەنێت.

**"مادەم گوڵی پەمەیی لە لقە قاوەییەکانەوە دەگەشێتەوە، کەواتە پێویست بە نائومێدی ناکات."**

با ئەم وتەیەی مەولانا-ش ببێتە گوارەی گوێت.

## تۆ ئیتر ئەگەر باوەشیشم پیادا بکەیت ئازارم دەدەیت.

ئەگەر خۆشەویستی لەلای تۆ پشتگوێخستنی ئەو شتانەیە کە بۆم کردوویت، ئەوا منت خۆشنەوێ. ئەگەر خۆشەویستی لەلای تۆ ڕووکردنە دەرگایە لە بچووکترین کێشەدا، ئەوا منت خۆشنەوێ. ئەگەر خۆشەویستی لەلای تۆ تەنها لەسەر زارە و واناکەیت هەستی پێبکەم، ئەوا منت خۆشنەوێ. ئەگەر خۆشەویستی لەلای تۆ خەمبارکردنی منە و دواتر هەڵسوکەوت کردنە وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت، ئەوا منت خۆشنەوێ. ئەگەر خۆشەویستی لەلای تۆ شکاندنەوەی ئێمەیە لەو شوێنەی من چاکمکردۆتەوە، ئەوا منت خۆشنەوێت. ئەگەر خۆشەویستی لەلای تۆ نەبینینی منە لە کاتێکدا کە من سەیری هەر شوێنێک دەکەم تۆ دەبینم، ئەوا منت خۆشنەوێت. ئەگەر خۆشەویستی لەلای تۆ پڕکردنەوەی جێگای منە بە کەسێکیتر، ئەوا منت خۆشنەوێ. ئەگەر خۆشەویستی لەلای تۆ ئەوەیە نەتوانیت هەنگاوێکیش بنێیت بەرەو من کاتێک من ڕادەکەم بۆت، ئەوا منت

خۆشنەویێ. تۆ ئەو کەسەیت کە نیشانتدام هەرچەندە هەوڵیش بدەم هەر ناتوانم هیچ شتێک بگۆڕم. دەڵێیت خۆشمدەوێیت، بەڵام لە هەموو لایەکەوە منت ڕوخاند. تۆ ئیتر ئەگەر باوەشیشم پیادا بکەیت ئازارم دەدەیت.



**مەیەرەوە،**

**دیسان بە نیوەیی بەجێم دەهێڵیتەوە.**

## لە من بە بەهاتر نیت.

بە ڕای من مرۆڤەکان کەمێک لە گەڵای دارەکان دەچن. کاتێک دارەکە ڕادەوەشێنن یان کاتێک ڕەشەبایەک هەڵدەکات دەبینین هەندێک لەو گەڵایانە هەڵدەوەرن. ئەوانە کەسە بێهێزەکانن. هاوڕێیان ژیان سەختە، مرۆڤەکان خراپن. هەموومان ئەمە دەزانین. بەڵام ئەمە بە واتای وازهێنانمان نایەت. ڕێگە نادەین لە ژێر پێی هەموو کەسێکدا پان ببینەوە. ڕۆژانی گەردەلوولاوی ڕومان تێدەکات، بەڵام ئێمە هەر دەتوانین خۆمان بە دارەکەمانەوە بگرین. پانکردنەوەی گەڵا وەریوەکان ئاسانە. ئەگەر دەتوانن با ئازارێک یان کەسێک بێت و هەوڵ بدات لە لقەکەتان بکاتەوە. بەهێز بن. ئەگەر بێ هێزیشبن ئەوا هەر خۆتان وا دەربخەن کە بەهێزن. چونکە هەندێک کەس هێز لە بێهێزی ئێوەوە وەردەگرێت.

ئەم ڕستەیە کەمێک کلاسیکە، بەڵام لەم ژیانەدا هیچ شتێک لە ئێوە بە بەهاتر نییە. بۆ تێگەیشتن لەمە پێویست ناکات شەوانە بچیتە سووچێکی جێگاکەتەوە و فرمێسک بڕێژیت، پێویستیش ناکات تا سەر ئێسقان هەست بە ئازارێک بکەیت و پەشیمان ببیتەوە. بینینی بێ باکی مرۆڤەکە بەسە بە زیادیشەوە. ئیتر

چاوەکانت بکەرەوە. تێبگە لەوەی نابێت لە خۆت زیاتر بەها بە هیچ کەسێک بدەیت. کێ دەردی تۆ بە هی خۆی دەزانێت؟ کێ هاوبەشی کام ئازارەت دەبێت؟ کێ هاوبەشی خەمتە؟ کەس نییە هاوبەشی خەمیشت بێت. ژیان بەردەوامە. هەموو کەسێک سەرقاڵە، دەیەوێت بگاتە شوێنێک، ئامانجێکی هەیە کە دەیەوێت پێی بگات. لە ناو ئەم هەموو سەرقاڵییەدا کەس نایەت بۆلات و بڵێت وەرە باسیکە و گوێت لێبگرێت. کەس نابێتە هاوبەشی خەمەکانت. هەموو کەس تەنها بیر لە خۆی دەکاتەوە. تۆش بیر لە خۆت بکەرەوە. چونکە کاتێک خەمبار دەبیت کەس لە تۆ زیاتر خەم ناخوات. سەیرکە پەیامی سەفا چی دەڵێت: "دڵخۆشبە، چونکە کەس گوێ بە خەمباری تۆ نادات".

**کە خەمباربووم لە من زیاتر خەمبار دەبیت؟**
**هەردووکمان دەزانین، دەڵێیت؛ "لەلاتم"**
**و دوای دوو ڕۆژ تۆش دەڕۆیت.**
**ببورە، لە من بە بەهاتر نیت.**

## هەموو کەسێک هەڵتدەخەڵەتێنێت.

کاتێک هەبوو وامدەزانی ئەو کەسانەی پێشتر ناسیومن و متمانەم پێ دەکردن زیانیان بۆ من نابێت. ماوەیەک هەستەکانم، بیرۆکەکانم و دڵمم دەسپارد بە کەسانێک تەنها لەبەر ئەوەی دەمناسین و وامدەزانی زیانیان بۆ من نابێت. بەڵام ئیتر تەواوبوو. بۆچی؟ چونکە هێندە بینیومە هەموو کەسێک بە ئاسانی، بێ ئەوەی بۆ ساتێکیش بیر لە ئەنجامەکەی بکاتەوە هەموو شتێک دەکات، ئیتر چاوم کرایەوە. هەموو ئەو کەسانەی دەمگوت؛ "ئەو شتی وا ناکات." ئەو شتەیان کرد. ئەو کەسانەی دەمگوت؛ "ئەو زیان لە من نادات" گەورەترین زیانیان لێدام. ناسیاوەکانم لە هەموو کەس زیاتر هەڵیانخەڵەتاندم و ئەو کەسانەی زۆرترین متمانەم پێ دەکردن گەورەترین ئازاریان دام. بۆیە ناسیاوەکانم هیچ جیاوازییەکیان نەما لەگەڵ نەناسیاوەکانمدا. هەموو کەس بۆ من وەک یەکە...

**ئەم وتەیەی 'ئەسکەندەری بچووک' بکە بە گوارەی گوێت:**

**"نابێت هەرگیز بڵێیت من ئەو زۆر باش دەناسم.**

**هەموو کەسێک هەڵتدەخەڵەتێنێت."**

## "ڕابردوو خۆڵە، فووی لێ بکە با بڕوات."

ستیفانو دی ئانا

ژیان کورتە گیانەکەم. ئەم دونیایە سێ ڕۆژە و تۆ دوو ڕۆژی بە بیرکردنەوە لە ڕابردووەوە بەسەر دەبەیت. ڕووداوەکانت دێتەوە یاد. خۆت بۆ کەسانێک و چەند ڕووداوێک ماندوو دەکەیت کە هیچ مانایەکیان نییە. وا لە خۆت مەکە. ناتوانم بڵێم؛ "ڕابردووت لە یاد بکە" بەڵام مەشیهێنەرەوە یادی خۆت. دەزانم ئێستا پێم دەڵێیت؛ "ئاخر ئەوە هێندە ئاسان نییە". باشە لێت دەپرسم؛ کێ ئەمڕۆت پێ دەداتەوە کە بە بیرکردنەوە لە ڕابردوو بیرت چووە ئەمڕۆ بژیت و ناحەقیت بەرامبەر کردووە؟ هیچکەسێک. بۆیە لەمە زیاتر ناحەقی بەرامبەر ئەمڕۆ و خۆشت مەکە.

سەیرکە هەموو کەسێک دڵخۆشە و بەردەوامە لە ژیانی خۆی. بیر لە دوێنێ مەکەرەوە، چونکە جارێکیتر ناگەڕێتەوە. سەرنج بخەرە سەر ئەمڕۆ و بەیانی. بە توندی باوەشیان پێدا بکە. چەندینساڵیتر پەشیمان دەبیتەوە بۆ ئەو شتانەی نەتکردووە. بۆچی ساڵەکانی تەمەنت بە فیڕۆ دەدەیت؟ بۆچی

لە جیاتی ئەوەی دوای چەندین ساڵ بە شتێک بزانیت ئێستا پێی نازانیت؟ دەبێت قەدری ئەمڕۆ بزانیت کە بە بیرکردنەوە لە ڕابردوو خەریکیت بەسەری دەبەیت. جارێکیتر نایەیتەوە ئەم دونیایە.

ئەم وتەیەی 'موراتهان مونگان'م زۆر بە دڵە:

**"ئەگەر بەردەوام ئاوڕ بدەیتەوە بۆ دواوە و سەیری ڕابردوو بکەیت، ئەوا ملت وەردەگەڕێت".**

## کەس بە کەڵکمان نایەت.

کاتێک بیرم لێ کردەوە، سەیر دەکەم هەتا ئێستا خۆم هەموو برینەکانی خۆمم سارێژ کردووە.

هەموو جارێک کە کەوتووم خۆم دەستی یارمەتیم بۆ خۆم درێژ کردووە.

کاتێک شتێکم بەسەر هاتووە سەرم خستۆتە سەر شانی خۆم لە جێی ئەو کەسانەی پێویستم پێیان بووە.

گوێکانم هێندە درۆیان بیستووە،

ئومێدەکانم هێندە بە نیوە ناچڵی ماونەتەوە،

هەستەکانم هێندە زیانیان پێ گەیشتووە،

بۆیە لەوێ بەدواوە تەنها باوەڕم بەخۆم کردووە.

دواتر بە خۆمم گوتووە:

"کەس بە کەڵکی من نایەت، من لە هەموو کەس زیاتر پێویستم بە خۆمە".

**بە باشی ئاگاداری خۆتبە.**

**ڕۆژێک هەموو کەس دەڕوات،**

**ئەو کاتە تەنها تۆ خۆت چاکدەکەیتەوە.**

**با کەسانێک لە ژیانتدا هەبن**
**کە شتت پێ دەبەخشن.**
**نەک کەسانێک کە شتت لێ دەبەن.**

هەبوونی ئەو کەسانەی بوون و نەبوونیان وەک یەکە لە ژیانتدا، وەک ئەوە وایە کرێی دوکانێکی داخراو بدەیت. هیچ قازانجێکی بۆتان نییە، بەڵام بە جۆرێک زیانتان لێ دەدات کە ئیتر ناتوانن بێنەوە سەر خۆتان. بە گریانێکی ساختەوە دێن بۆلاتان و هەموو ئەو شتانەتان لێ دەسەنن کە دەیانەوێت. بەڵام کاتێک دەبێت شتێکتان پێ ببەخشن لە ناکاو دیارنامێنن. ئەو کەسانە لە ژیانتاندا دەربکەن کە تەنها جێگە دەگرن لە ژیانتاندا و بە کەڵکی هیچ شتێکیتر نایەن و هیچ سوودێکی ماعنەوییان نییە بۆتان. با کەسانێک لە ژیانتاندا بێت کە ئامادەبن هەموو کاتێک لە هەموو بابەتێکدا یارمەتیتان بدەن. هیچنەبێ با کەسانێک هەبن لە ژیانتاندا ئەو کتێبانەتان پێشکەش بکەن کە خوێندوویانەتەوە و هێڵیان بە ژێر ڕستە گرنگەکانا هێناوە بۆتان. با کەسانێک هەبێت کە شیعرێکتان پێشکەش بکەن. با کەسانێک هەبن کە کاتێک سەیری چاوەکانیانتان کرد وەک ئاوێکی ڕوون بێت و بتوانن

لەوێوە ناخی ببینن. با کەسانێک هەبن کە دڵنیابن لە خۆیان هیچ نیشانەیەکی پرسیارتان لەلا درووست نەکەن و لە هیچ بابەتێکدا نەتانخەنە گومانەوە. با کەسانێک هەبن لە ژیانتاندا کە بە هەبوون و نەبوونیان ماندووتان نەکەن. ئەگەر ماندووشیان کردن با کەسانێکبن کە بتوانن پشووتان پێ بدەن.



**هیوادارم هەمیشە ڕێگاتان لەگەڵ کەسانێکدا یەک بگرێتەوە کە ڕێگاکەتان جوانتر دەکەن.**

## لەمە بەدواوە ئاوایە.

لەمە بەدواوە ئاوایە، زۆر بیری منە کۆنەکە دەکەن. لەمە بەدواوە بە خەمەوە دەچم بەرەو ئەو کەسەی من خەمبار دەکات و بە دڵخۆشییەوە دەچم بەرەو ئەو کەسەی دڵخۆشم دەکات. ئیتر وەک پێشتر بەتەنها خۆم ماندوو و شەکەت ناکەم. ئەو ڕۆژانە تێپەڕین. هەوڵدان و خۆشویستنی تاکلایەنە هیچ قازانجێکی بۆ من نەبوو. بە پێچەوانەوە زۆریش ئازاریدام. ئیتر ئاوا نیم. ئیتر خۆتان شوێنی خۆتان لەلام دیاری دەکەن. ئێوە چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ من بکەن منیش ئاوا هەڵسوکەوتتان لەگەڵ دەکەم. هەرکەسە شایەنی چی بێت منیش ئەوەی پێ دەدەم. ناتوانم خۆم بۆ کەسانێک ماندوو بەم کە کاتێک خەمبارم لە من زیاتر خەم ناخۆن. خۆم خەریک ناکەم بە چاککردنەوەی ئەو پەیوەندییانەی بەرامبەرەکەم تێکیداوە. ڕێی ئەو کەسانە قیرتاو دەکەم کە دەیانەوێت بڕۆن، تا ئاسانتر بڕۆن. ئەوانەش لە ژیانمدا دەهێڵمەوە کە دەیانەوێت بمێننەوە. ئیتر خۆم بۆ کەسانێک ماندوو ناکەم کە شایەنی نین.

**ئەو کەسانە نوقومیان کردم کە وامدەزانی بەندەری منن.**
**من ئیتر لە خۆم زیاتر بۆ هیچ کەسێکیتر نابەم.**

**بەدوای هۆکاردا گەڕام بۆ خۆشویستن. لە جێی ئەوەی بەدوای بەهانەدا بگەڕێم بۆ خۆشنەویستن.**

هەمیشە چەند هۆکارێکی بچووک بەسبوون بۆ خۆشەویستیم. هەرگیز ڕامنەکردووە لە خۆشەویستی. بە دوای بەهانەدا نەگەڕاوم بۆ خۆشنەویستن. هیچ شتێکم بە کەس نەگوتووە کە لە دڵمەوە نەهاتبێت. ئومێدی بەتاڵم بە کەسێک نەدا کە هیچ هەستێکم بۆی نەبوو و دواتر بەجێم نەهێشت. هەرگیز بە شێوەیەکی جیاواز باسی خۆمم نەکردووە. هەمیشە چۆن هەستم کردووە و چۆن بیرم لە کەسی بەرامبەرم کردوەتەوە بەو شێوەیە هەنگاوم ناوە بۆلای. بەدوای هۆکارا گەڕام بۆ خۆشویستن، نەک بەدوای بەهانەدا بگەڕێم بۆ خۆشنەویستن.

هەرچەندە بە ئازاری گەورە وەڵامی هەموو ئەمانەم درایەوە، بەڵام هەر هەوڵمدا. کەس ناتوانێت بە من بڵێت هەوڵت نەداوە، هەتا کۆتایی هەوڵمدا. من و ویژدانم ئاسوودەین. واتا دەمەوێت بڵێم، هۆکار زۆرە بۆ خۆشویستن. دەکرێت شێوازی پیاڵە گرتنیت

خۆشبوێت، ئەو دێڕانەی کتێبەکەیت خۆشبوێت کە خەتی بەژێردا هێناون، میهرەبانییەکەیت خۆشبوێت بەرامبەر پشیلەیەک. هەر وەک گوتم؛ هۆکار زۆرە بۆ خۆشویستن. ئەوەندە بەسە کە تۆ بتەوێت خۆشتبوێت. ئەوەندە بەسە کە دڵتی پێشکەش بکەیت. ئەوانەی قەدرت نازانن با لە دواوە بمێننەوە. با تەنها ئەو کەسانە خۆشیانبوێیت کە قەدرت دەزانن.

**کەس ناتوانێت بە کەسێک بڵێت هەوڵت نەداوە**
**کە هەموو ئەو فیداکارییەی کردووە بۆ خۆشەویستییەکەی.**

## با ویژدانت ئاسوودە بێت، ئەوەیتری چارەسەر دەکرێت.

گوێم لێیە هەموومان دەڵێین من ویژدانم ئاسوودەیە، شتێکتان پێ بڵێم؛ ئەگەر هیچ شتێکیش نەبێت، هەستێکی ئەوەندە خۆشە مرۆڤ هەر ئەوە بکات کە لەسەریەتی و بچێتەوە سووچەکەی خۆی و بتوانێت بڵێت من ویژدانم ئاسوودەیە، ئەو کەسە بە هیچ شتێک ناگۆڕمەوە.

تا ئێستا بۆ هەرکەسێک کە هاتبێتە ژیانمەوە، هەر کەسێک و هەر شتێک بووبێت کە زانیومە سەردەگرێت یان نا، بۆ هەموو شتێک هەتا کۆتایی هەوڵمداوە. هیچ گرنگ نییە کە سەری گرتووە یان نا. بەڵام یەک بەندەی خودا ناتوانێت بێتە بەردەمم و بڵێت؛ "هەوڵت نەداوە". هێندە بە توندی پەتەکەم گرتووە کە کەس نەتوانێ وا بڵێت. چونکە هێندە هەوڵم بۆداون کە کەس نەتوانێت بێتە بەردەمم و پێم بڵێت؛ "هەوڵت نەداوە". نازانم شایەنی بوون یان نا، بەڵام ئەوە بەسە بۆ ئەوان کە بزانن من هەر هەوڵمداوە.

**مرۆڤ کە توانی بڵێت من ئەوەی لەسەرمبوو کردم، ئیتر خۆی دەدات بەدەست ئارامییەوە.**

## من بەسم بۆ خۆم.

هەوڵنادەم هیچ بۆ کەس باس بکەم، چونکە دەزانم کەسیان تێناگەن. هەوڵنادەم کەسانێکم خۆشبوێت کە دڵیان خۆشەویستی هەر نەبینیووە. ئەو کەسانە ناهێنمە ژیانمەوە کە بە نیازی ڕۆیشتنەوە دێن بۆلام. باسی ناخم بۆ ئەو کەسانە ناکەم کە تەنها قسەی بێ مانا دەکەن. نازانم ئێوە بەمە دەڵێن چی، بەڵام من دەڵێم چوومەتەوە سووچەکەی خۆم. پێویستم بە کەس نییە، من بەسم بۆ خۆم.

ژیان سەختە، مرۆڤەکان بێ کەسایەتین و منیش زۆر تەنهام. بەڵام هیچ ناڕازی نیم لەم تەنهاییە. ئەمە بەتەواوی هەڵبژاردەی خۆمە. هەرگیز ناڕازی نەبووم لەم دۆخە. بە پێچەوانەوە ئاوا باشترە. بەردەوام ناڵێم "تۆ بڵێی بە ڕاستی منی خۆشبوێت؟ ئایا بەو شێوەیەی سەیری من دەکات سەیری کەسانی تریش دەکات؟ ئایا ئەو ئومێدانەی دەیدات بە من دەیدات بە کەسانی تریش؟" و لە هەموو ئەم خەم و گومانانە بەدوورم. من و تەنهایم ئاوا زۆر باشین. ئەو کەسانە ناهێنمە ژیانمەوە کە دێن و من پەیوەستی خۆیان دەکەن، دوای دوو ڕۆژ من و خۆشەویستییەکەم، ئەو هەموو ئەمەکەی داومە و دڵە شکاوەکەم

بەتەنها بەجێدەهێڵێت. ئەوەندەی پێم بکرێت لە هەموو کەسێک و هەموو شتێک ڕادەکەم. تەنهایی بەس بۆ خودا باشە، بەڵام ئیتر باوەڕ بە بەندەکانی ناکەم. بۆیە لە جیاتی ئەوەی پەنا بۆ خۆشەویستی درۆ و هاوڕێیەتی ساختە ببەم، پەنا بۆ تەنهاییم دەبەم کە هیچ زیانێکی بۆم نییە و ناشبێت.



**ئێوە بەردەوامبن لە خۆشەویستییە درۆکانتان**
**منیش سەیرتان دەکەم.**

## زۆر سەر دەخەینە سەر پشیلەکان.

بۆ پشیلەکان نازانم، بەڵام مرۆڤەکان بەڕاستی سپڵەن. تەنانەت سپڵەیی پشیلەکان بە بەراورد بە سپڵەیی مرۆڤەکان هەر هیچ نییە. ئەگەر شتێک بۆ کەسێک بکەیت دەڵێن بۆ کردت. بۆی نەکەیت دەڵێن بۆ نەتکردووە و زۆر ئیهمالیت. نهێنییەکت پێ بڵێم؛ هیچ بۆ کەس نەکەیت باشترە. چونکە کەس شایەنی بچووکترین هەوڵیشت نییە. لە کۆتاییدا هەر تۆ زەرەر دەکەیت. فیداکارییەکانت بە هەدەر دەچن. هەندێک شت هەیە مرۆڤ زۆر درەنگ لێیان تێدەگات. دواتریش دەچێتە بەردەم ئاوێنەکەی و دەڵێت؛ "من بۆ ئەمە ئەو هەموو هەوڵەمدا؟"

لە ڕاستیدا ئەوان تاوانبار نین. ئێمە تاوانبارین. ئێمە نازمان بەواندا و وامانکرد وا بزانن ناتوانین وازیان لێ بهێنین. بۆیە هیچ بۆ کەس مەکەن. گوتەیەک هەیە دەڵێت؛ "هەتا تۆی خۆشنەوێت تۆش ئەوت خۆشنەوێ، ئەگەر نا پارچە پارچە دەبن." زۆر زۆر ڕاستە. هەر کەسێک گوتبێتی زۆر جوانی گوتووە. ئەوەی بیەوێت لەلامان بمێنێتەوە خۆی دەردەکەوێت. تا ئێستا بەشی پێویست پارچە پارچەبووین. ئیتر بەسە.

**ئەوانەی بە پشیلە دەڵێن سپڵە،**
**دڵنیابن ئەو کەسانەیان نەبینیووە**
**کە چاکەم لەگەڵ کردوون.**

## بۆچی مرۆڤ دەڵێت خۆشمدەوێیت و دواتریش دەڕوات؟

هاوڕێیان، بەڕاستی ئەقڵتان وەریدەگرێت کەسێک کە بەڕاستی خۆشیبوێیت بتوانێت بڕوات؟ هەمیشە گوتوومە و ئێستاش دەیڵێمەوە؛ کەسێک کەسێکی خۆشبوێت ئەوا هەر دەمێنێتەوە. چۆن دوو کەڕەتی دوو دەکاتە چوار ئەمەش ئاوا ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە... کاتێک ئەو کەسانەی ئێوەیان خۆشناوێت بەجێتان دەهێڵن مەڵێن تۆبڵێی من شتێکم کردبێت، ئایا من تاوانبارم؟ خۆتان بۆ ئەم جۆرە کەسانە خەمبار مەکەن. ڕۆیشتنی هەندێک کەس دەبێتە لەدایکبوونێکی نوێ بۆتان.

با کەسانێک هەبێت لە ژیانتاندا کە لە کاتی کێشەکاندا لەگەڵتاندا بمیننەوە و لەگەڵتاندا بەدوای چارەسەردا بگەڕێن، لە جێی ئەو کەسانەی لە بچووکترین کێشەدا ڕوو لە دەرگاکە دەکەن. باشە، مرۆڤ بۆچی دەڕوات؟ پێموایە ئەم پرسیارە دوو وەڵامی هەیە. یەکەمین، هەروەک پێشتر گوتم، تۆی خۆشناوێت. دوومیشیان، کەسێکیتر سەرنجی ڕاکێشاوە. کەس ناتوانێت بەجێتان بهێڵێت هەتا کەسێکیتر نەدۆزێتەوە بۆ جێگاکەتان. بە

تایبەتی ئەو کەسانەی خۆشەویستی نازانن. ئەم کەسانە وەک ئۆتۆمبێل وان، بەبێ تایەی یەدەگ بەڕێ ناکەون. نەبوونی ئێوە هیچ کێشە نییە بۆ ئەوان. نابێت ئێوەش بۆ کەسانی ئاوا خەمبار بن و ئەو دڵە جوانەتان ئازار بدەن. شایەنی ئەوە نین. ئەمانە وەستان لە لەدەستدانی کەسانی عاشقدا. پێویست ناکات ئێوە ببنە یاری دەستی ئەوان. دڵنیابن خۆشەویستی ڕاستەقینە بە هەموو شێوەیەک خۆی دەردەخات. ڕێگە بۆ هەموو ئەو کەسانە بکەنەوە کە بوێری لەدەستدانی ئێوەیان هەیە و بێ ئێوەیی لە خۆیان دەوەشێننەوە. چونکە هەندێک کەس زیاتر ئارەزوو دەکەن ڕێگەیان بۆ بکەنەوە لە جیاتی دەرگای دڵتان.

**ڕێگە شایەنی ڕۆیشتووەکانە،**
**عەشق شایەنی ئەوانەیە کە دەمێننەوە...**

## ڕۆیشتووەکان دووبارە دێنەوە؟

چاوەڕێی گەڕانەوەی ئەو کەسانە مەکەن کە نەتاندەویست بڕۆن، بەڵام ئەوان بەهانەی بێمانایان هێناوەیەوە بۆ ڕۆیشتن. هەر کە ڕۆیشتن دەرگاکە لەدوایانەوە دابخەن. تەنانەت کێلونەکەشی بگۆڕن با هەر کە ویستیان نەگەڕێنەوە و دوبارە هەمان ئازارتان نەدەنەوە و وێرانتان نەکەن. کەسێک ئەگەر جارێک ڕۆیشتبێت ئەوا ئەم کارە دەکات بە خوو. ئێوە بڕیار دەدەن لەسەر ئەوەی ڕێگە بەمە بدەن یان نا.

هەمیشە گوتوومە و دەیڵێمەوە؛ ناتوانن کەسێک بوەستێنن کە ڕۆیشتنی خستۆتە مێشکییەوە. هەر نابێت هەوڵیش بدەن بۆ وەستاندنیان. با بڵێین ڕۆیشت، کە گەڕایەوە هەرگیز نابێت قبوڵی بکەنەوە. ناکرێت کەی ویستیان بێن و کەی ویستیان بڕۆن. نابێت بە دڵی خۆیان هەڵسوکەوت بکەن و بۆ ساتێکیش بیر لەوە نەکەنەوە کە ئێوە چۆن هەست دەکەن. نابێت ئێوەش تەنها لەبەر ئەوەی خۆشتاندەوێن ڕێگەیان پێ بدەن هەموو ئەمانە بکەن، نابێت هێندە لێبووردەبن بەرامبەر هیچ کەسێک. ئەوەی دەڕوات با بڕوات ئەوەشی دەیەوێت بمێنێتەوە هەر لە سەرەتاوە دیارە.

دەبێت مرۆڤ ڕێزی بەرامبەر خۆی هەبێت. ناڵێم لووتبەرزبێت، دەڵێم دەبێت ڕێز لە خۆی بگرێت. پێموایە گەورەترین دەوڵەمەندی مرۆڤ لەم ژیانەدا ڕێزییەتی بەرامبەر خۆی. مرۆڤ کە ڕێزی بەرامبەر خۆی نەما ئیتر هیچ شتێکی نامێنێت لە ژیاندا. بۆیە ڕێی ئەوانە بکەنەوە کە دەیانەوێت بڕۆن و ڕێگەش بەوانە مەدەن کە دەیانەوێت بگەڕێنەوە. لە جیاتی ئەوەی بە ئومێدێکەوە چاوەڕێی گەڕانەوەی ڕۆیشتووەکان بکەن، بڵێن ڕۆیشتووەکان ئەگەر بشگەڕێنەوە من قبوڵیان ناکەم، چونکە کەس لە ڕێزم بەرامبەر خۆم گرنگتر نییە.

**بە زۆری لە کام بابەتانەدا بەهەڵەدا چوون؟**
**من کاتێک ئەوانەی وامدەزانی هەرگیز ناڕۆن ڕۆیشتن،**
**بۆم دەرکەوت چەند بەهەڵەدا چووم.**

## مرۆڤ کۆی ئەزموونەکانییەتی

تۆ لە هەموو ساتێکیدا لەلای ئەو بوویت. لە دڵخۆشیدا، لە ئازاریدا، لە خەمباریدا و بە کوورتییەکەی هاوبەشی هەموو شتێکی بوویت. هەوڵتدا سەیری هەر شوێنێکی کرد تۆ لەوێ بیت. کەسانیتر خەمباریان کرد بەڵام هەر تۆ لەلای بوویت. کەوت، تۆ هەوڵتدا هەڵیسێنیتەوە. هەموو شتێکت کرد بۆ کۆکردنەوەی ئەو. هەموو ئەوەت کرد کە مرۆڤێک دەتوانێت بیکات بۆ یارمەتیدانی کەسێکیتر. لەوانەیە قەدری ئەوانەیان نەزانیبێت کە کردووتە، بەڵام تۆ هەرچەندە دەتزانی ئەو ڕێگایەی پیایدا دەڕۆیت ڕێگایەکی ڕاست نییە هەر وازت نەهێنا لێی.

هەر بۆ ساتێکیش بیرت نەکردەوە لەوەی ئایا شایەنییەتی یان نا. تەنها لەبەر ئەوەی لەو ساتەدا دەتەوێت خۆتدا بەدەستەوە بۆ هەستەکانت و هەموو شتێکت بۆ کرد. ئەی ئەو چی بۆ کردیت؟ کە هەستایە سەر پێ تۆی هەر لەبیر کرد. کە چاک بوەوە تۆی هەر نەناسی. ئەو هەموو شتەی پشتگوێ خست کە بۆتکردووە. کێ قەدری خۆشەویستییەکەت و ئەو شتانەی

زانیوە کە بۆت کردووە؟ کەس. ئەوانەی واتدەزانی شایەنین، شایەنی هیچ نەبوون. ئەمەش بووە هۆی نەهێشتنی باوەڕت بەوەی کەسێک بتوانێت تۆی خۆشبوێت. هەموو ئەو کەسانەی لە دڵەوە خۆشەویستیان کرد دۆڕان.

**هەندێک هۆکاری لەسەر حەقم هەیە**
**بۆ متمانە نەکردن بە کەس.**

**"قۆڵت شکا؟ خەم مەخۆ،**
**لەوانەیە خودا باڵت پێبدات."**

حەزرەتی مەولانا

سەیرێکی ئەو ژیانەت بکە کە ناڕازیت لێی. لە کاتێکدا کە هەناسەکانیشت کاتین، وا دەزانیت دەردەکانت هەمیشەیین؟ باوەڕم پێ بکە ڕۆژێک دێت هەموو ئەو شتانەی دەڵێیت تێناپەڕێت، تێدەپەڕن. ئەوانەی دەڵێیت تەواونابن، تەواو دەبن. وە ژیان هەر بەردەوام دەبێت. تەندروستیت باش؟ دەتوانیت ئەو هەناسەیەی هەڵیدەمژیت بیدەیتەوە؟ بەڕای من ئەمانە هۆکاری پێویستن بۆ سوپاسگوزاری و زانینی قەدری ئەو ژیانەی هەتە. سەیرکە ئەم

گوتەیەی 'نەجیب فازل کساکورێک' چەند جوان قەدری ژیان دەهێنێتەوە بیری مرۆڤ: "زۆر ڕۆژ هەیە کە بێزار دەبم لە ژیان، دەچم بۆ گۆڕستانەکان و لەوێ قەدری ژیانم بۆ دەردەکەوێت. ئەگەر ئێوەش لە ژیان بێزاربوون ئەوا بچن بۆ گۆڕستانێک. بەڕاستی لەوێ لە قەدر و گرنگی ژیان تێدەگەن و فێردەبن سوپاسگوزاربن. لەبیری مەکەن کە جگە لە مردن چارەی هەموو شتێک هەیە. قەدری هەموو چرکەیەک و هەناسەیەکتان بزانن".

**لە خەڵک زیاتر داوای لێبووردن لە خۆم دەکەم**
**لەبەر ئەوەی کەسانی زۆر ناپێویستم هێنایە**
**نێوان خۆم و ژیانم.**
**لەمە بەدواوە کەسم لە خۆم زیاتر خۆشناوێت.**

## کەمێکیش بۆ خۆت بژی

دەڵێم؛ ناکرێت کەمێکیش بۆخۆت بژیت؟ کات زۆر بە خێرایی تێدەپەڕێت و دەبێت قەدری ئەو هەناسەیە بزانیت کە ئێستا هەڵیدەمژیت. وازبهێنە لەوەی بەها بە کەسانی ناپێویست بدەیت، وایان لێ بکەیت وا هەست بکەن ناتوانیت وازیان لێ بهێنیت. متمانە بە کەسانی هەڵە بکەیت، کەسانێک بهێنیتە ناو ژیانتەوە کە شایەنی ئەوە نین سەلامیشیان لێ بکەیت. واز لەوەش بهێنە هەوڵ بۆ کەسانێک بدەیت کە هیچ کەسایەتییەکیان نییە تا دڵنیابیتەوە لەوەی ئایا کەسە ڕاستەکەن یان نا.

تا ئێستا هەر بۆ ڕازیکردنی کەسانێک ژیاویت. هەمیشە هەوڵتداوە بۆ دڵخۆشکردنی کەسانیتر. هاوڕێکانت، خێزانەکەت، خۆشەویستەکەت... "گوتت با هەموو کەس دڵخۆشبێت، ئەگەر پێویست بکات با من دڵخۆش نەبم".

بەڵام ئیتر بەسە، ئەمڕۆ دووبارە نابێتەوە. لەم ژیانەدا کەسێکی دیکەی وەکو تۆ دووبارە نابێتەوە. بە دواخستنی دڵخۆشی خۆت بۆ بەیانی ئەمڕۆ لە ژیانی خۆت دەدزیت. نابینیت

ئەو بەیانییەی بە ئومێدەوە سەیری دەکەیت هەر ووردە ووردە ژیانت دەبات؟ هەر ئێستا وازبهێنە لەوەی بڵێیت ئەو چی دەڵێ و ئەم چی دەڵێ. نابێت ئەم ژیانە بەپێی قسە و بیرکردنەوەی کەسانیتر بژیت. ئیتر کەمێکیش بۆ خۆت بژی. چونکە جارێکیتر نایەیتەوە ئەم ژیانە.



**قۆناغێک هەیە کە تیایدا تێدەگەیت**
**کەس لە تۆ بە بەهاتر نییە،**
**ئیتر گرنگی بە هیچ شتێک نادەیت.**

## لەبارەی حوکمی پێشوەختەوە

'دۆوان جوجێئۆغڵو' دەڵێت؛ "حوکمی پێشوەختە وەک ئەوەیە هەنگوین نەخۆیت چونکە هەنگ پێوەیداویت". پێشوەختە حوکم لەسەر کەس مەدەن هەتا نەیناسن. بە گشتی بیر لە ڕووداوەکانی ڕابردوومان دەکەینەوە و بەمەش دەڵێین ئەزموون و بە ترسەوە لە هەموو شتێک نزیک دەبینەوە و پێشوەختە حوکمیان لەسەر دەدەین. دەبینە ئەسیری ئەو شتانەی وا دەزانین ڕاستن. لێی ناپرسینەوە، گوێناگرین و لە هەمووشی گرنگتر، لێی تێناگەین. سەیردەکەین بەڵام نابینین. لەو شتانەشدا کە وادەزانین بینیومانە بە هەڵەدا دەچین. ناحەقی هەم بەرامبەر خۆمان دەکەین هەم بەرامبەر کەسانی بەرامبەرمان. دەمەوێت باسی چیرۆکێکتان بۆ بکەم کە ئەم ماوەیە بە زۆری دێتەوە بەردەمم.

ڕۆژێکیان کوڕ و باوکێک گەشتێکی شەمەندەفەر دەکەن. کوڕە گەنجە بیست و چوار ساڵەکە لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد و لە ناکاو هاواری کرد: "بابە سەیرکە، دارەکانمان بەجێهێشت." باوکی زەردەخەنەیەکی کرد، بەڵام

ئەو ژن و مێردەی لە تەنیشتیانەوە دانیشتبوون سەریان لەم هەڵسوکەوتە منداڵانەیە سوڕمابوو. گەنجە بیست و چوار ساڵەکە دووبارە هاواری کردەوە: "بابە سەیرکە هەورەکانیش لەگەڵماندا دێن!" ژن و مێردەکەی تەنیشتیان خۆیان پێنەگیرا و لە پیاوە پیرەکەیان پرسی: "وابزانم کوڕەکەتان پێویستی بە یارمەتییە. بۆچی نایبەن بۆلای پزیشکێکی باش؟" باوکەکە وەڵامیدایەوە و گوتی: "کوڕەکەم بە کوێری لەدایکبوو، ئەمڕۆ چاوەکانی کرایەوە. ئێمەش لەلای دکتۆرەوە دێینەوە".

'ئالدۆس هوکسلی'

**جوانترین چارەسەری لەم بارەیەوە دۆزیوەتەوە:**

**"تەنها یەک شت هەیە لە هەموو گەردووندا**

**کە مرۆڤ بتوانێت بە تەواوی چاکی بکاتەوە،**

**ئەویش خۆیەتی."**

## ئەرێ بەڕاست، خۆشەویستی چیبوو؟

باشە خۆ خۆشەویستی ئەمەک نەبوو، چاکە نەبوو؟ دیارە وا نەبووە. یان خۆشەویستی ناو گۆرانییەکان، فیلمەکان و شیعرەکان ئەوە نەبوو کە بەسەر ئێمەدا هات. چونکە ئەمەکمان بە کێ دابێت و بردبێتمانە دڵمانەوە لە کۆتاییدا چووە سەر سەرمان. ئەوانەی دەستمان گرتن و بەیەکەوە ڕۆیشتین کاتێک بابەتەکە بوو بە خۆشەویستی هەموویان هەر لە دوامانەوە مانەوە. چاوپۆشیمان لە هەموو ئەو شتانە دەکرد کە کردیان و دەمانگوت چاک دەبێت، بەڵام ئەوان هەموو ئەو نیەتە باش و متمانەیەمانیان ڕوخاند.

بۆیە ئیتر باوەڕم بەو "تۆشم خۆشدەوێ"یە نییە کە لە دەمی هەموو کەسێکەوە دێتە دەرەوە، ناتوانم باوەڕی پێ بکەم. واز لە بەڵێنەکانیان بهێنە، ئێستا ئەو کەسانە هەر ناناسمەوە کە پێشتر دەمناسین. یان ئێوە بێگانەن بە خۆشەویستی من، یان من لەو شتە تێناگەم کە ئێوە پێی دەڵێن خۆشەویستی.

**من ئیتر هێزی خۆشویستنی دیکەم نەماوە.**
**ئەو کەسانە حەواڵەی خودا دەکەم**
**کە منیان خستۆتە ئەم دۆخەوە.**

## عەشقە تاک لایەنەکان

هەندێک عەشق هەیە تاکلایەنەیە، تۆ ئەوت خۆشدەوێت. دەیهێنیتە ژیانتەوە. هەموو خولەکێک زیاتر خووی پێوە دەگریت. باوەڕ بە خۆت دەهێنیت کە هەرگیز ناڕوات. ڕۆژێک ئاوڕدەدەیتەوە دەبینیت ڕۆیشتووە. بەهەڵەدا چوویت. ناخت دەسووتێت، بەڵام ناتوانیت ئەو لە دڵت دەربهێنیت. ناتوانیت هێندە بە ئاسانی واز لە هەندێک شت بهێنیت. ئەو وەک ئەوەی هەر نەهاتبێتە ژیانتەوە بەردەوام دەبێت لە ژیانی خۆی، بەڵام تۆ ناتوانیت. ئەو هەموو ئازار و یادەوەرییانەت بۆ بەجێدەهێڵێت و دەڕوات. بەڵام هەر ناتوانیت لێی تورە ببیت. چونکە عەشق، عاشقبوونی ئەو ئازارانەشە کە ئەو بۆت بەجێدەهێڵێت و باوەشکردنە بەو ئازارانەدا. هەندێک عەشق هەیە کە تاکلایەنەیە و هەر لە دڵی خۆتدا دەژی. هەندێک دەڕوات، هەندێک بیری دەکات. هەندێک خۆشیناوێت، هەندێکیش سەرەڕای ئەوەی تا سەر ئێسقان هەستدەکات خۆشناویستریێت بەڵام هەر خۆشیدەوێت. لەوەتەی دنیا دنیایە هەر وابووە و واشدەبێت. هەموو عەشقێک قارەمانێک و بکوژێکی خۆی هەیە.

بکوژەکە ئەو کەسەیە کە ئەو هەموو کاتە، ئەو هەموو یادەوەرییە، ئەو هەموو ڕووداوە، ئەو هەموو بەها و خۆشەویستییە

دەکوژێت، وا دەکات بەرامبەرەکەی واهەست بکات کە هەرگیز ناڕوات و پاشان دەڕوات. قارەمانەکەش ئەو کەسەیە کە هەموو شتێک دەکات بۆ ڕزگارکردنی پەیوەندییەکەی. مادەم ئێستا ئەمە دەخوێنیتەوە ئەوا تۆ قارەمانی عاشقەکەتیت. لە کاتێکدا کە ئەو هەوڵی دەدا بۆ لەناوبردنی هەموو شتێک، تۆ هەوڵت دەدا بۆ هێشتنەوەی خۆشەویستییەکەت و پەیوەندییەکەت. ئەم ئاسوودەیی ویژدانە بەسە بۆ تۆ.



**ڕۆژێک کەسێک دێت و نیشانت دەدات**
**خۆشویستراوی چییە.**
**هێندە بە جوانی خۆشیدەوێیت**
**کە دەڵێیت: "شایەنی هەموو ئەو ئازارانە بوو**
**کە چەشتم".**

## "ناتوانیت بڵێیت هەوڵتنەداوە."

نە لە ناخمدا بچووکترین پەشیمانی هەیە لە بارەی تۆوە، نە ئازاری ویژدانم هەیە. دەزانیت بۆچی؟ چونکە هەوڵمدا، تاقیمکردەوە. من هەموو کاتێک دڵم خستە سەر دەستم و بەرەو تۆ هاتم. چاوپۆشیم کرد لە هەموو ئەو دوودڵییانەت، ئەو خۆ بە زلزانینەت کە نەتدەزانی چیت دەوێت و هەست بە چی دەکەیت و ئەو قسە ڕەقە ئازاربەخشانەت. بەڵام ساتێکی وا هات کە دڵم گوتی؛ "بەسە ئیتر! ئەم کارە لێرەدا تەواو دەبێت". هەرگیز خۆشەویستی یەک لایەنە سەرناگریت. بەڵێ لەبارەی تۆوە ویژدانم ئاسوودەیە. دەزانم تاوانی تۆ نییە هی منە. سەرەڕای ئەوەی شایەنی هیچ نەبوویت بەڵام خۆشمویستیت، جێگەم کردیتەوە لە ژیانمدا، هەموو شتێکم تاقیکردەوە تا منت خۆشبوێت و خۆم خستە ژێر باری قورسەوە. تاوانبارم چونکە لە ناو ئەم هەموو کەسە ئاساییەدا تۆم بە جیاواز دەزانی و لە ناو ئەم هەموو کەسە پیسەدا تۆم بە پاک دەزانی. ئەها هەمیشە پێم دەگوتیت؛ "تۆ بۆ من جیاوازیت." ئێستا تۆش وەکو هەموو کەسێکیت بۆ من. تۆ بە قورسی سزای ئەو کەسانە دەدەیت کە خۆشیاندەوێیت.

فێربووم کە نابێت فیداکاری بۆ هەموو کەسێک بکەم. مرۆڤ تەنها هێندەی گەورەیی دڵی دەتوانێت کەسێکی خۆشبوێت. هەتا کوێ دەتوانم لەگەڵ کەسێکدا بم کە گرنگ نیم بۆی، بەسە ئیتر من پێم نەما.



**مرۆڤ دوای ئەوەی هەموو ئەو شتانەی کرد**
**کە لەدەستی هاتووە**
**هەست بە ئاسوودەییەک و دڵخۆشییەکی بێ وێنە دەکات.**
**هیوادارم ئێوەش هەستی پێ بکەن.**

## دایە، تۆ هەمیشە لەسە حەقبوویت.

بەڵێ دایە، تۆ هەمیشە لەسەر حەقبوویت. زۆری پێچوو تا لەمە تێگەیشتم. ئەها جارێکیان پێت گوتم؛ "پێش ئەوەی هەنگاوێک بەرەو کەسێک بنێیت هەزار جار بیربکەرەوە". ئەها هەمیشە پێت دەگوتم؛ "سەیری قسەی خەڵکی مەکە، بەڵکو سەیری هەڵسوکەوتەکانیان بکە". دایە ئەها هەمیشە پێت دەگوتم؛ "زۆر ئاگاداربە متمانە بە کێ دەکەیت، لەگەڵ کێدا دەڕۆیت و کێت خۆشدەوێت. چونکە قەرەبووی ئەو ساڵانە ناکرێتەوە کە هەندێک هەڵە لە ژیانتی دەبەن و پەشیمانی دەخەنە سەر زارت".

هەر بەڕاست قەرەبوو ناکرێنەوە دایە. بەڵام هەندێک شت هەیە مرۆڤ هەتا بەسەریدا نەیەت فێری نابێت. نەمتوانی ئەو ماسکانە ببینم کە کردبوویان بە ڕووخساریانەوە. ئەها هەمیشە پێت دەگوتم؛ "ئاخریت خێر بێت". کاتێک لە کۆتایی ڕێگەکەدا زۆربەی ئەو کەسانەم لەدەستدا کە لەگەڵیاندا بەڕێکەوتبووم تێگەیشتم مەبەستت چی بووە. بەڵام ئەم ئەزموونە زۆر ماندووی کردم. ماندووبووم. بەڵام ئەم ماندوێتییە جەستەیی

نیە. ماندووبوم لە نییەت باشیم، لە لەدەستدانی کەسانی ناو دڵم و ئەو هەوڵانەشی کە دەمدا بەو ئومێدەی ڕۆژێک هەموو شتێک باش ببێت. ئیتر نییەت باشیم گەورەترین دوژمنمە. دەترسم لەو کەسانەی نییەت باشیمیان بینیوە.

دەترسم، چونکە دەزانم نییەتە باشەکانم بەکاردەهێنن.



**من ئیتر شەڕ لەگەڵ ئەو لایەتاندا ناکەم کە**
**نە دەزانێت چی دەوێت و نە دەزانێت هەست بە چی دەکات.**
**ئێوە وابزانن منتان بەزاندووە،**
**بەڵام من بەمە دەڵێم؛ "گەورەبوون".**

## "نییەتە باشەکانیشتان خراپە."

من بە قورسترین شێوە سزای متمانە کردم بە ئێوە وەرگرت، سزاتاندام. پەشیمانتان کردمەوە لەوەی متمانەم پێکردوون، بەهام پێداون و خۆشمویستوون. ئەوە بەسنەبوو، بەڵکو هەتا سەرئێسقان پەشیمانتان کردمەوە. ئیتر بە ڕۆڵ بینینەکانتان هەڵناخەڵەتێم. چونکە زۆر باش دەزانم ئەوانەی دەڵێن من هەرگیز زیانت لێ نادەم گەورەترین زیانم لێ دەدەن، ئەوانەی دەڵێن من لە هەموو کەسێک جوانتر خۆشمدەوێیت موحتاجی دڵۆپەیەک خۆشەویستیم دەکەن و ئەوانەی دەڵێن متمانەم پێ بکە پەشیمانم دەکەنەوە لەوەی هەر متمانەشم پێکردوون.

دەتوانم بێ کەسایەتیتان لە پشت ماسکی کەسایەتییەوە ببینم. لە ڕاستیدا هەمیشە وامدەزانی هەموو کەس وەک منە. بۆیە هەر من دۆڕام. بەڵام ئیتر ئاوا نیم. زۆر باشتر دەزانم کێ چییە. بۆ نموونە ئێستا لە خۆم زیاتر بەها بە هیچ کەسێک نادەم، و خۆشمناوێن. هەست بە خراپەی پشت نییەتە باشەکانتان دەکەم. لەمە بەدواوە متمانە بە کەستان ناکەم. کاتێک ویستم باوەش بە

کەسێکدا بکەم، باوەش بەخۆمدا دەکەم. کاتێک ویستم کەسێکم خۆشبوێت خۆمم خۆشدەوێت. پێویستم بە کەس نییە. ئیتر من بەسم بۆ خۆم.



**پێشتر باوەڕم بەم ڕۆڵی خۆشەویستییانەتان دەکرد.**
**بەڵام ئێستا تەنها پێیان پێدەکەنم.**

## من بەسنەبووم بۆ تۆ.

هەرچییەکم کرد نەمتوانی ڕازیت بکەم نە بەسبم بۆت، نە ئەو شتانەی بۆم کردیت، نە هەوڵەکانم، نە فیداکارییەکانم، نە ئەمەکەکانم، نە خۆشەویستیم و بە کورتی هیچ شتێکم بەسنەبوو بۆت. نەمتوانی بەسبم بۆت. چونکە ئەگەر هەموو دنیاش بخەنە ژێر پێی کەسێکەوە کە هەرچەندە دەستی تۆی گرتووە بەڵام چاوی لە دەرەوەیە، هەر ڕازی نابێت. منیش نەمتوانی ڕازیی بکەم. ئەو خۆشەویستییە جوانەم بەسنەبوو بۆ تۆ. لە بچووکترین کێشەدا ڕووت لە کەسانیتر کرد.

سەرەڕای ئەمەش هەرجارێک تۆ ڕۆیشتیت من هەر چاوەڕێم کردیت. چەندین جار هاتیتەوە و چەندین جار ڕۆیشتیت. من هەر وازم نەهێنا. چونکە بۆ وازهێنان خۆشمنەویستبوویت. نەمدەتوانی ئەو کەسایەتییەت چاک بکەمەوە کە هێشتا بەتەواوەتی جێی خۆی نەگرتوو. بەڵام چاوەڕێم کرد تا بگۆڕێیت. ویستم ببینیت چەندم خۆشدەوێیت. هەر نەتبینی. تۆ قەدری کەسێکت نەزانی کە سەرەڕای هەموو شتێک هەر تۆی دەویست، لە هەموو بوارەکانی ژیانیدا تۆ لە هەموو شتێک گرنگتربوویت بۆی و لە خۆی زیاتر بیری لە تۆ دەکردەوە. لە کۆتاییدا بینیم هەر ناکرێت،

ئیتر منیش ڕۆیشتم. تۆش هەر نەتگوت مەڕۆ. ئەو کاتە تێگەیشتم تۆ شایەنی هیچ شتێکی من نیت، شایەنیشی نابیت. شایەنی هیچ کام لەو شتانە نیت کە بۆم کردوویت. نزای خراپت لێ ناکەم، تەنها بۆ ئەوەی لە من تێبگەیت، هیوادارم کەسانی وەک خۆت بێتە سەر ڕێگات.

**گلەیی بێت لە خۆشم،**
**چاوەڕێی هاتنی کەسێکم کرد کە هەر هیچ نەهاتبوو.**

# چیرۆکی دوپشک و کیسەڵ.

**"بە ئومێدەوە چاوەڕێی گۆڕانی هەندێک کەس دەکەن؛ بەڵام مار تەنها پێستەکەی دەگۆڕێت، خووەکانی ناگۆڕێت."**

دەمەوێت ئێستا چیرۆکێکتان بۆ باس بکەم، پێموایە کاتێک ئەم چیرۆکە دەخوێننەوە بۆ ساتێک خۆتان دەخەنە جێی بۆقەکە. ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆقێک لە نزیک ڕووبارێکەوە دانیشتبوو و دووپشکێک لێی نزیک بوەوە. کاتێک بۆقەکە بینی دوپشکەکە لێی نزیکبوەتەوە لە ترسدا ڕاچڵەکی و کەمێک دوورکەوتەوە. کە دوپشک ئەمەی بینی بە بۆقەکەی گوت: "بۆقی برام ئەوە منم، دەبێت بچمە ئەوبەری ڕووبارەکەوە، دەتوانیت یارمەتیم بدەیت؟" بۆقەکە کەمێک بیری کردەوە و گوتی: "چۆن شتی وا دەبێت، تۆ دوپشکیت، من چۆن تۆ ببەمە ئەوبەرەوە، تۆ زیانم پێ دەگەیەنیت". هەرچەندە بۆقەکە نییەت باشبوو، بەڵام دوپشکەکە هیچ وانەبوو. لەبەر ئەوەی باش دەیزانی ئەم وەڵامەی دەداتەوە بە بۆقەکەی گوت: "مەترسە، من هیچ زیانێکت پێناگەیەنم، ئەگەر پێتەوە بدەم ئەوا منیش دەکەومە ناو ڕووبارەکەوە و

بەیەکەوە دەمرین". بۆقەکە کەمێک بیریکردەوە و لەبەر ئەوەی ئەم وەڵامەی دوپشکەکە زۆر مەنتقیبوو بەلایەوە بڕیاریدا بیباتە ئەوبەری ڕووبارەکەوە.

کاتێک دەگەنە نیوەی ڕێگاکە بۆقەکە هەستی بە ژانێک کرد لە پشتەملیدا. لەشی بە خێرایی سارد دەبووەوە، هەستی بە قۆڵ و قاچەکانی نەدەکرد. کاتێک خەریکبوو نوقم دەبوو لە کۆتا هەناسەیدا بە دوپشکەکەی گوت: "من متمانەم پێکردیت، خۆ گوتت پێمەوە نادەیت، بۆ وات کرد؟" دوپشکەکە شانەکانی ڕاوەشاند و گوتی: "چیبکەم خووم پێوەگرتووە".

ئێستا دەڵێن بۆچی ئەم چیرۆکەت بۆ ئێمە باسکرد. سەیرێکی ئەو کەسانە بکەن کە هێناوتانەتە ژیانتانەوە و بیخەنە لای ئەو دوپشکەوە. ئێوەش دەبینن کە ڕێک وەک یەکن و هیچ جیاوازییەکیان نییە. هەندێک کەسیش ڕێک وەک دوپشکن. لە سەرەتادا دێن و وادەکەن متمانەیان پێبکەن، بێتاوانانە لێمان نزیک دەبنەوە وەک ئەوەی هەرگیز زیانمان پێنەگەیەنن و هەرگیز نەڕۆن. دواتریش لە ساتێکدا کە هیچ چاوەڕێی ئەوەیان لێ ناکەین، ژەهراویمان دەکەن. دواتر بەو ژانەی ناخماندا تێدەگەین دوپشکێک لە بەرگی مرۆڤدا پێوەیداوین.

متمانەیان پێدەکەین، باوەڕیان پێدەکەین. خۆشماندەوێن، بەهایان پێ دەدەین. ئەنجام؟ بە ئازاری ناختەوە دەمێنیتەوە. دەڵێیت خۆزگە متمانەم پێنەکردنایە، بەڵام دەمێکە کار لە کار ترازاوە. ناتوانیت هیچ بکەیت.



**لەبەر ئەوەی بە ئازاری زۆر گەورە**
**وەڵامی متمانەکانم درایەوە،**
**هێندە بە ئاسانی ناتوانم جارێکیتر متمانە بە کەس بکەم.**

**بە گریانەوە منت بەو ڕێگایەدا ناردەوە**
**کە بە پێکەنین و دڵخۆشییەوە پیایدا هاتبووم بۆلات.**
**من لەبیربکە، بەڵام ئەمە لەبیر مەکە.**

## پێویستمان بە ڕاستگۆییە،
## پێویستمان بە نییەتی ڕاستگۆییە.

دەرگام بەڕووی ئەو ڕاستگۆیی و هەستانەدا داخراوە کە دوای ئەوەی من گوتم بە زۆر بۆم دەردەخەن. هەمیشە ئەو کار و ئەمەکانەی بێ ئەوەی من بیڵێم دەکرێت زۆر بە بەهان لەلام.

ناسینی کەسێک بەواتای پرسینی ئەو شتانەی بە دڵیەتی و بە دڵی نییە هەوڵسوکەوتکردن بەپێی ئەو وەڵامانە نایەت. بۆ نموونە؛ هەر کەسێک بیەوێت من بناسێت ئەم پرسیارەم لێ دەکات: "ئادەی باسیکە، چیت بە دڵە و چیت بە دڵ نییە؟" کە من ئەوانەم گوت ئیتر چ مانایەکی دەمێنێتەوە، خۆت هەوڵبدە من بناسیت. چونکە پێم باشە کەسی بەرامبەر خۆی بیدۆزێتەوە کە حەزم لە چییە و حەزم لە چی نییە لە جیاتی ئەوەی من پێی بڵێم. لە ژیانی مندا جێی ئەو هەست و پەیوەندییانە نابێتەوە کە لەسەر داواکاری خۆم درووستبوون.

با لە ژیانی ئێوەشدا جێگەی نەبێتەوە. ئەو شتانەی بێ ئاگاداری من دەکرێت، بەها بێهۆکارەکان، ڕاستۆیی و نییەتی

ڕاستگۆیی هەمیشە جێگەیەکی بێ پایانی هەیە لە ژیانمدا. ڕێگە مەدەن بە پرسیار کردن لە خۆتان و بەپێی وەڵامەکانی ئێوە بتانناسن و هەڵسوکەوتتان لەگەڵ بکەن. وازیان لێ بهێنن خۆیان بتانناسن.

هیچ گرنگ نییە دۆخی ئێستاتان باشە یان خراپ. ڕێگە مەدەن ئەو کەسانەی هەتا ئێستا زەڕڕەیەک مافیان بەسەر ئێوەوە نییە و هیچ ئەمەکێکیان پێ نەداون تەنها بە قسە بتانناسن. دڵتان بەڕووی پەیوەندییە داواکراوەکاندا دابخەن. ئەوەی بیەوێت، خۆی دەتوانێت قفڵی ئەو دەرگایە بکاتەوە.



**ئەگەر تۆش وەک کەسانی ئەم سەردەمە بیرناکەیتەوە، ئەوا وەک خۆمیت.**

## ویستم شایەنی هەوڵەکانم بێت

دەمەوێت بەس یەک جار شایەنی هەوڵەکانم بن. با یەک جار پەشیمان نەبمەوە لە ناسینی کەسێک. با یەک جار خۆم لەلای ئەو مانایانەدا پان نەبمەوە کە بەخشیومە بە شتێک.

هەرکەسێک بناسم دەبێتە پەشیمانی بۆم... هەرکەسێک دەهێنمە ژیانمەوە لێم کەم دەکاتەوە. با یەک جار بە بێوەفایی وەڵامی فیداکارییەکانم نەدرێتەوە. بەڵام ناکرێت ئیتر، هەرچییەک بکەم ناکرێت. دەست بۆچی درێژ بکەم وێران دەبێت. کێ بناسم پەشیمان دەبمەوە. هەوڵ بۆ هەرچییەک دەدەم وەک ئەوەیە بێ هۆ سەوڵ لێبدەم. مانا بە هەرچییەک ببەخشم خۆم لە ژێر ماناکانیدا پاندەبمەوە. پێشتر کەسانی نوێم دەناسی. مەراقی چیرۆکەکانیانم دەکرد و گوێم لێ دەگرتن.

دەمویست کەسێک لە ژیانمدا بێت، خۆشمبوێت، خۆشیبوێم و هاوبەشی هەموو ساتەکانم بێت. بەڵام ئیتر نەک هەر کەس ناهێنمە ژیانمەوە، بگرە هەوڵنادەم کەسیش بناسم. چونکە دەزانم ئەو کەسانەی هەوڵ دەدەم بیانناسم دواتر دڵم دەشکێنن. من پەنام بۆ تەنهاییم برد و لەوێدا پشوو دەدەم.



**وتەیەکی زۆر جوان و تاڵی 'دۆستۆڤسکی' هەیە:**
**"هەموو هێزی خۆمم بە شەڕکردن**
**لەگەڵ ئەو بێهێزییەی ناخمدا تەواوکرد."**

## بۆچی دەدۆڕێیت؟

با من پێت بڵێم بۆچی دەدۆڕێیت. پێش هەموو شتێک، وادەزانی هەموو کەس وەک خۆتە. سەرەتا دەبێت بزانی ناکرێت هەموو کەسێک وەک خۆت بێت گیانی من. هەموو کەسێک وەک تۆ بە وردی بیرناکاتەوە. هەموو کەسێک دڵێکی وەکو دڵی تۆی نییە. دەبێت هەر ئێستا بووەستیت لەوەی وەک خۆت سەیری کەسانیتر بکەیت و وابزانیت هەموو کەس وەک تۆیە.

بۆ هەموو کەسێک دەڵێیت؛ "ئەمە زیان بە من ناگەیەنێت"، "ئەو شتی وا ناکات". بە دوو ڕستەی جوان باوەڕیان پێ دەکەیت. دواتر سەیر دەکەیت خەریکیت شەڕ لەگەڵ ئەو ئازارانەدا دەکەیت، ئەوانەی گوتوتووتە ئەمە زیان بە من ناگەیەنێت بۆیان بەجێهێشتوویت. وامەکە.

دواتر بەها بەو کەسانە دەدەیت کە شایەنی ئەوەنین لە هەموو ژیانیاندا بۆ جارێکیش گوێیان لە دەنگیشت بێت. سەرەڕای ئەمانە هەوڵیشیان بۆ دەدەیت. زۆر دواتر تێدەگەیت کە شایەنی ئەوانە نەبوون، بەڵام ئیتر هیچت لەدەستنایەت. بۆ نمونە؛ لە

خۆت زیاتر گرنگیان پێدەدەیت. لە دڵخۆشی خۆت کەمدەکەیتەوە و هەوڵ دەدەیت کەسانیتر دڵخۆش بکەیت. سەرەڕای ئەوەی دەشزانیت ئەوان هیچ شتێکت بۆ ناکەن. بەردەوام تۆ خۆت خستە ژێر بارەکانەوە. لە کاتێکدا کە کەس پەنجەیەکیشی لەبەر تۆ نەدەجولاند تۆ هەر هەوڵت بۆ دان، بۆیە دەدۆڕێیت.

لە ناخی تۆدا گەردەلول هەڵدەکات، بەڵام لە ناخی ئەواندا گەڵایەکیش لەبەر تۆ ناجولێتەوە. بۆیە دەدۆڕێیت. هەوڵی هێشتنەوەی کەسانێک دەدەیت کە لە لەدەستدانی تۆ ناترسن و بێ تۆیی لە خۆیان دەوەشێننەوە. بۆیە دەدۆڕێیت. لە کاتێکدا کە ئەوان پەنا دەبەن بۆ بەندەریتر تۆ لە دەریای ئەواندا دەخنکێیت. بۆیە دەدۆڕێیت.

بەڵام ئیتر بەسە. لەمە بەدواوە خۆت بۆ هیچ کەسێک ماندوو مەکە. هەوڵمەدە بۆ بەدەستهێنانەوەی ئەو کەسانەی تۆیان لەدەستداوە. ئەوانە بەڕێبکەن کە دەیانەوێت بڕۆن، پێشوازی لەوانە بکەن کە دەیانەوێت لەلات بمێننەوە. چونکە دۆڕان لە تۆ ناوەشێتەوە.

**گوێ لەم ڕستەیەی 'نازم حیکمەت' بگرە:**
**"من هیچ لەدەست نادەم بە نەبوونی ئەو کەسانەی بوێری لەدەستدانی منیان هەیە."**

## متمانەمان بە کەسانی هەڵە کرد

هەموومان دەزانین کە متمانە شکا جارێکیتر دروست نابێتەوە. باشە کە ئەمە دەزانن ئیتر بۆچی وا دەزانن چانسی دووەم ئێوە ڕزگار دەکات و ئەو متمانانە دەشکێنن کە پێتانبەخشراوە؟ یان با بەم شێوەیە بپرسم؛ چۆن بە باری ڕستەی؛ "خۆزگە هەر متمانەم پێنەکردیتایە"ی کەسێکەوە دەتوانن بژین؟ نازانن کە دواتر زۆر بەدوای متمانە و خۆشەویستی ئەو کەسانەدا دەگەڕێن کە هەموو شتێکیان کرد بۆ متمانە کردن بە ئێوە، لە ناو ئەم دونیا خراپ و پیسەدا هەوڵیاندا بە دڵی ئێوەوە بنیشنەوە، بەڵام بۆتان نادۆزرێتەوە.

زەڕڕەیەک قەدری ئەو باهایەی پێتان بەخشراوە، ئەو متمانەیەی پێتاندراوە و ئەو خۆشەویستییەی خراوەتە بەردەمتان، نازانن. هەموو شتێک لەناو دەبەن و دەڕۆن. دواتر دەڵێن پەشیمانم و دەگەڕێنەوە. هیچ شەرم ناکەن لەوەی ئەو کەسانەی کاتی خۆی وایاندەزانی ئێوە کەسە ڕاستەکەن، ئێستا وەک کەسێک دەتانبینن کە نابێت هەرگیز لە ژیانیاندا متمانەی

پێبکەن. عەزێت مەکیشن، ئێمە لە جێی ئێوە شەرم دەکەین کە متمانەمان پێکردوون. چونکە بە قورسی سزادراین لەسەر ئەوەی متمانەمان بە ئێوە کرد.



**هەوڵمان بۆ تەواوکردنی هەر کەسێکدا،**
**ئێمە بە نیوەیی ماینەوە.**
**وا دەزانین هەموو کەسێک وەک خۆمانە.**
**لەوانەیە لێرەدا هەڵە بکەین.**

## تۆ زۆر قەرەباڵغیت

من ئارەزووی ئەو هەستە جوان و ڕاستگۆیانە دەکەم کە لە تەنهاییدا دەردەکەون. دارێکم کە ئاگام لە دارستانەکەی دەوروبەرمە و جیاوازییەکانی خۆشم دەزانم. وە من هێندە جوان و تایبەت خۆشمویستیت کە هەتا ئێستا کەس کەسی ئاوا خۆشنەویستووە و خۆشیشینەویت، بەڵام تۆ زۆر قەرەباڵغیت. ئەم قەرەباڵغییە هەردووکمان ماندوو دەکات. من دونیایەک ماندوێتیم هەیە کە پێیان دەگوترێت مرۆڤ. تۆ مەیە. لە کوێ دڵخۆشیت لەوێ بمێنەرەوە. بەتایبەتی مانەوەت لەلای کەسێکی قەرەباڵغ بەکەڵی چی دێت؟

**ئەم وتەیەی 'بوراک ئاکسان'م زۆر بەدڵە:**
**"هەموو کەسێک هێندە قەرەباڵغە،**
**بچیتە ژیانی هەر کەسێکەوە دەبیتە زیادەیەک."**

## ئارامم نەما

"ئەگەر کەسێکیت کە وزەی ئەرێنی بە دەوروبەرتدا بڵاو دەکەیتەوە، ئەوا دەبێت زیاتر ئاگاداری خۆت بیت. نابێت ڕێگەیان پێ بدەیت ئەو دونیایەی لە مێشکی خۆیاندا درووستیان کردووە بیخەنە مێشکی تۆشەوە و وزەکەت لێ بدزن. نابێت خۆت ناچار بکەیت لەو کەسانە تێبگەیت کە پێیانوایە لە ژیاندا تەنها کێشە و نەهامەتی هەیە. خۆت خەریک مەکە لەگەڵ ئەو کەسانەی تێناگەن ژیان موعجیزەیەکی ڕاستەقینەیە، جوانی وەک شیعری تێدایە و ژیان بە شێوەیەکی جیاواز بە ڕووی هەموو مرۆڤێکدا پێدەکەنێت. تەنانەت یەک خولەکیشت تەرخان مەکە بۆ ئەو کەسانەی تەنها باسی کێشەکانی پەیوەندییەکانیان دەکەن و ئەو هەموو خۆشییە پشتگوێ دەخەن کە بینیویانە.

ئەو کەسانە بێدەنگ بکە کە هیچ نازانن لە بارەتەوە و هێشتا هەوڵ دەدەن قسە بکەن. خۆت بە دووربگرە لەو کەسانەی قەدرت نازانن. سنووری خۆشیان نیشانی ئەو کەسانە بدە کە قەدرت دەزانن و دەیانەوێت پشتگوێی بخەن. ئەو کەسانە لە

دەفتەرەکەتدا بسڕەرەوە کە هەوڵدەدەن وات لێ بکەن شەڕ لەگەڵ شتی بێ مانادا بکەیت. ئەو کەسانە دەربکە لە ژیانت کە هەوڵ دەدەن پێکەنینەکانت بدزن. ئەو کەسانە لە خۆت دووربخەرەوە کە پەیوەندییەکان دەکەن بە بار بەسەرتەوە و لە مێشکی خۆتدا ئەمە بچەسپێنە؛ پەیوەندییەکان دەبێت دڵخۆشیت بۆ بهێنن.

بە کورتییەکەی ئەو مێشکە جوانەی بە چەندین ساڵ پڕت کردووە لە وزەی جوان، ماندووی مەکە بە بیرکردنەوە و ڕێگە مەدە بێ مێشکەکان بە کەمت بزانن..."

فرانک دیناترا

## درەنگ کەوتین

من و تۆ بۆ هەموو شتێک درەنگ کەوتین. درەنگ کەوتین بۆ ئەو فیلمانەی بەیەکەوە سەیرمان دەکرد، ئەو شارانەی بەیەکەوە دەچووین بۆی، ئەو خواردنانەی بەیەکەوە دەمانخوارد، ئەو کتێبانەی بەیەکەوە دەمانخوێندەوە، ئەو گۆرانیانەی بەیەکەوە گوێمان لێ دەگرتن و ئەو عەشقەی بەیەکەوە دەژیاین تیایدا. درەنگ کەوتن یەکێکە لەو شتانەی لە ژیاندا قەرەبوو ناکرێتەوە.

ئەوەشمان بە جوانترین شێوە کرد. لە کاتێکدا دەبوو باوەش بەیەکدا بکەین، زۆر یەکتریمان شەکەت کرد. لە جیاتی ئەوەی برینەکانی یەکتر سارێژ بکەین، زیاتر ئازاری یەکترماندا. تۆ لە ساتێکی وادا لە من ڕۆیشتیت، بە هیچ هاتنەوەیەک ناتوانیت قەرزی عەشقەکەت بدەیتەوە. لەوانەیە هەر یەکمان نەناسیایە و نەچووینایەتە ژیانی یەکترەوە و وەک دوو بێگانە بمابینایەتەوە باشتر بوایە. ئێستا ئەگەر دڵت دەربهێنیت و بیشیخەیتە بەر دەمم، ئێمە هەر نابین بە هیچ. چونکە ئێمە لە هەموو شتێک زیاتر بۆ یەکتر درەنگ کەوتین. گوناهەکەی لە ملی هەردووکماندایە. ئێمە بەیەکەوە ناحەقیمان بەرامبەر ئەم عەشقە کرد.

**ژیان بە خۆشەویستییەوە جوان بوو،**
**بەڵام ئێمە سەرکەوتوو نەبووین.**

## ئەگەر سەرناگرێت زۆری لێ مەکە

که سەیرت کرد سەرناگرێت، زۆری لێ مەکە... بەسە ئیتر خۆت زۆر ماندوو کرد بۆ کەسانێک که شایەنی نین. نابینیت سەرناگرێت ئیتر؟ خۆشیناوێیت. وەک ئەوەی ئەمە بەس نەبێت، دەچێت بە ڕووی کەسیتردا پێدەکەنێت. کەسیتری خۆشدەوێت. سەرەڕای ئەوەی دەشزانێت چەند پێویستت پێیەتی، بەڵام هەر لەلای کەسانیترە. تۆش هەوڵ دەدەیت تا شتێک سەربگرێت. دەزانی بە زۆر شتی باش نابێت؟ بەڵام با من پێت بڵێم؛ ناحەقی بەرامبەر خۆت دەکەیت. تۆ شایەنی کەسێکی لەو باشتریت. نازانیت دوای چەندین ساڵیتر بە خۆت پێدەکەنیت لەبەر ئەوەی خۆشەویستیت پێشکەشی کەسانێک کردووە که هیچ شایەنی نەبوون، تاک لایەنە هەوڵت داوە بۆ سەرگرتنی هەندێک شت، هەرچەندە دەتزانی سەرناگرن، بەڵام هەر زۆرت لێکردن. گیانی من بە خۆڕایی خۆت ماندوو خەمبار دەکەیت. وامەکە. هەستەرەوە سەرپێ، لەمە بەدواوە هەر کە بینیت شتێک سەرناگرێت ئیتر واز لە هەوڵدان بهێنە بۆی.

بۆ نمونە؛ ئێستا وەک پێشتر شەڕ بۆ شتێک ناکەم کە دەزانم سەرناگرێت. هەر کە تێگەیشتم سەر ناگرێت ئیتر وازی لێ دەهێنم. ڕێک لەو خاڵەدا ڕوونتر دەبینم کە؛ هیچ کەسێک شایەنی هیچ شتێک نییە.

## تۆم زۆر گەورە کردووە

هەرگیز ئەو ڕۆژە لەیاد ناکەم کە ئەم پرسیارەم لە خۆم کردبوو؛ "ئەگەر ئەو نەبێت من چی بکەم؟" کاتێک هەبوو کە بە ڕاستی هێندە تۆم خۆشدەویست و هێندە خووم پێوە گرتبوویت ئەم پرسیارەم لە خۆم دەکرد.

ئێستا سەیر دەکەم من بەبێ تۆ زۆر باش ژیاوم. تۆم زۆر گەورە کردوە. دوای ئەوەی تۆ ڕۆیشتیت هیچ شتێک نەگۆڕا. پاسەکان هەر ئەو گەشتانەیان کرد کە دەبوو بیکەن، کەشتییەکان هەر لەو کاتەدا بەڕێکەوتن کە دەبوو بەڕێبکەون. فیلمی تازە بڵاودەکرێتەوە، دۆلار جارێک بەرز دەبێتەو جارێک دادەبەزێت. هەندێک کات هەور بە ئاسمانەوەیە، کەمێک باران دەبارێنێت. دواتر دووبارە خۆر دەردەکەوێتەوە. منیش وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت بەردەوامم لە ژیانم. کاتێک تۆم خۆشدەویست وامدەزانی بەبێ تۆ ناتوانم بژیم. بەڵام ئێستا تێگەیشتم کە بە هیچ زانینی ژیانی خۆت و پەیوەستبوون بە یەک کەسەوە هەڵەیەک چەند گەورە بووە.

ئەها پێم گوتیت بەبێ تۆ ناژیم، بەڵام توانیم بەبێ تۆش بژیم. من دوای تۆش ژیانێکم هەبوو و ئەوەتا دەژیم. من ئەگەر بیرۆکەکانی ئەو کەسەی منی خۆشدەوێت هێندە بگۆڕیایە و ئەم ڕستانەم لێوە ببیستایە زۆر شەرمم لە خۆم دەکرد.

بەڵام خەمت نەبێت، من شەرم لە خۆم دەکەم، لەبەر ئەوەی لە جێی تۆش تۆم خۆشویست. لە سایەی تۆوە ئیتر هیچ کەسێک گەورە ناکەم. کەس ناخەمە نێوانی من و ژیانمەوە. هێندە بەها دەدەم بە هەموو کەسێک کە شایەنییەتی، نە زیاتر نە کەمتر.



**ڕێک لەو شوێنەدام کە 'ئێجێ تێمێلکوران' دەڵێت:**
**"تۆ ئیتر تەنها خۆتیت. تەنها موڵکی خۆتیت.**
**ناتەوێت دووبارە ببیت بە شتی کەسێک ، تەنانەت ببیت بە**
**بەنرخترین شتیش. هەرچەندە ئەگەر بشتەوێت**
**سەرکەوتوو نابیت".**

## واز لە تۆ دەهێنم

هێندە هەوڵمدا و هێندە خەریکبووم بۆ وازنەهێنان لە تۆ، بەڵام لە کۆتاییدا ئەم شەڕەم دۆڕاند. پێم نەما. هیچ شتێکت نەهێشت لە ناخمدا سەبارەت بە تۆ. ئیتر وازت لێ دەهێنم. بەڵێ وازت لێ دەهێنم. ئیتر خۆشم ناوێیت، بیرت ناکەم. هەموو ئەو شتانەم فڕێدا کە تۆ دەهێننەوە یادم. چونکە ماندووبووم لە هەوڵدان بۆ شتێک کە سەر ناگرێت، هەوڵدانی یەک لایەنە بۆ هێشتنەوەی شتێک و گوتنی؛ "ئامین" بۆ نزایەک کە گیرا نابێت. ئیتر خۆم بە کەسێکەوە ناگرم کە منی فڕێداوە. ئێستا بۆخۆت دڵخۆشبە، من وازت لێ دەهێنم.

**ئیتر بە کەس ناڵێم "بمێنەرەوە" کە ویستی بڕوات.**
**بە پێچەوانەوە، دەرگاکەی بۆ دەکەمەوە.**
**هەرگیز خۆم بۆ کەسانێک ماندوو ناکەم**
**کە بێ منی لە خۆیان دەوەشێننەوە.**

با وتەیەکت پێ بڵێم لە پەیامی سەفا-وە:
**"دە کەمێک پێبکەنە! بەخوا دنیا ئەوە ناهێنێت."**

کەمێک ئازارت دەدات، کەمێک دەتگریەنێت، کەمێک بیری دەکەیت، کەمێک دڵخۆشت دەکات، بەڵام لە کۆتاییدا هەموو شتێک تێدەپەڕێت. مرۆڤ بە هەموو ئەو شتانە ڕادێت کە دەڵێت هەرگیز پێی ڕانایەم. هەموو ئەو شتانە تێدەپەڕێنێت کە دەڵێت ناتوانم تێیان بپەڕێنم. کەمێک نیگەران دەبێت بەڵام دواتر دەبینێت ئەو خودایەی دەردی بۆ ناردووە دەواکەشی دەنێرێت.

سەیربکە گیانی من، بەس خۆت خەمبار بکە. هەموو شتێک تێدەپەڕێت. کە خەریکبوو وا هەستبکەیت هیچ شتێک تێناپەڕێت، بیر لەو شتانە بکەرەوە کە پێشتر هاتوون و تێپەڕیون، چۆن ئەو شتانەی پێشتر بێزاریان دەکردیت و دەیانخنکاندیت ئێستا لەبیرت چوونەتەوە هەر ناشیەنەوە یادت. سەیربکە با چیرۆکێکت بۆ باس بکەم ڕێک لەم بارەیەوە؛

ڕۆژێکیان کەسێک چوو بۆلای حەزرەتی 'عەلی' و گوتی: "هێندە دەردەدارم خەریکە دەمرم لە خەمدا". حەزرەتی 'عەلی' گوتی: "دوو پرسیارت لێ دەکەم، کە وەڵامت دانەوە دەواکەت دەستدەکەوێت".

پیاوەکەش گوتی: "بپرسە ئەی عەلی". حەزرەتی 'عەلی' لێی پرسی: "ئایا بەم دەردانەوە لەدایکبوویت؟" پیاوەکە گوتی: "نەخێر". حەزرەتی 'عەلی' پرسییەوە: "ئەی کە لەم دنیایە ڕۆیشتیت بەم دەردانەوە دەڕۆیت؟" پیاوەکە دووبارە گوتی: "نەخێر". حەزرەتی 'عەلی' لە کۆتاییدا گوتی: "نابێت دەردێک کە لەگەڵ تۆدا نەهاتووە و لەگەڵ تۆدا ناڕوات هێندە کاتت لێ بگرێت. ئارامبگرە. لە جیاتی ئەوەی ئومێدت بەوانەی سەر زەوی بێت ڕوو بکەرە خودا".



**وادەزانی دەردەکان هەمیشەیین**
**لەم ژیانە کورتە کاتییەدا؟**
**ئارام بگرە، ئەمەش تێدەپەڕێت.**



**ئامۆژگاری ئەمڕۆ:**

**ڕستەکانم بۆ کەسانێک ماندوو مەکە کە تێناگەن.**

**هەستەکانت بۆ کەسانێک ماندوو مەکە کە هەستیان نییە.**

**"چاوەڕێ مەکەن ئەو کەسانەی لە ناو بیاباندا بەجێتان هێشتووون باخچەی گوڵتان پێشکەش بکەن."**

دەتانەوێت خۆشبویسترێن بێ ئەوەی خۆشتانبوێت، بەهاتان پێ بدەن بێ ئەوەی بەها بە کەس بدەن. پێتان ببەخشرێت بێ ئەوەی هیچ ببەخشن و لێتان تێبگەن بێ ئەوەی هیچ تێبگەن. دەتانەوێت ئەو کەسانەی لە ناوەڕاستی بیاباندا بەجێتان هێشتوون باخچەی گوڵتان پێشکەش بکەن. ڕاهاتوون بەوەی هەر لە جێی خۆتان دانیشن، هەر لە جێی خۆتانەوە قسە بکەن و بڵێن خۆشمدەوێیت و هیچ دەرینەخەن، دڵی ئەو کەسانە بشکێنن کە خۆشیان دەوێن و بەجێیان بهێڵن. ببوورن دنیایەکی ئاوا نییە.

هەموو شتێک بەرامبەرێکی هەیە. کێ چی ببەخشێت، چۆن هەڵسوکەوت بکات ئەوا بەرامبەرەکەی وەردەگرێتەوە. ئەو زەمەنە گوزەشت کە سێ قوروش بدەن و پێنج کفتە بکڕن. یان قەدری ئەو شتانە دەزانن کە هەتانە یان بەو شێوەیە هەڵسوکەوتتان لەگەڵدا دەکرێت کە هەڵسوکەوت دەکەن. ناتوانم ئێوە بخەمە لای دەستەواژەی "قەدر زانین"ەوە، بەڵام قەیناکە ئێمە شەڕ لەگەڵ خۆپەرستیشتاندا دەکەین.



**لە ڕاستیدا دەبێت وەک خۆتان**
**مامەڵەتان لەگەڵ بکەین.**
**ئەوکاتە لە هەستی ئێمە تێدەگەن.**

## بیسڕەرەوە با ئاسوودەبێت

لە کاتێکدا کە تۆ بە هێواشی دووردەکەویتەوە و ئەو بە ڕاکردن دووردەکەوێتەوە، بیسڕەرەوە با ئاسوودە بێت. ئەگەر کەسێک زیاتر لەو شتانەی پێی بەخشیویت شتت لێ وەردەگرێت، بیسڕەرەوە با ئاسوودە بێت. ئەگەر هەڵەکانی خۆی نابینێت و تەنها سەرنجی هەڵەکانی تۆ دەدات، بیسڕەرەوە با ئاسوودە بێت. گوێگرتنی ئەو کەسانەی تێناگەن بێ ئەنجامە. ئەگەر تەنها گوێت لێ دەگرێت و تێناگات، بیسڕەرەوە با ئاسوودە بێت. ئەگەر ماوەی ئەو کاتانەی سەرقاڵە لەو کاتانە زیاترە کە کاتی هەیە و هیچ کات بۆ تۆ تەرخان ناکات، بیسڕەرەوە با ئاسوودە بێت. ئەگەر خۆی هیچ ناکات و هەمیشە چاوەڕێیە تۆ هەنگاوێک بنێیت، بیسڕەرەوە با ئاسوودە بێت. ئەگەر تەنها باسی ئازارەکانی خۆی دەکات و بەهۆی خۆپەرستییەوە بەردەمی خۆشی نابینێت، بیسڕەرەوە با ئاسوودە بێت. ئەگەر لە هیچ ڕازی نییە و تەنها بیر لە خۆی دەکاتەوە، بیسڕەرەوە با ئاسوودە بێت. ئەگەر لەبەر بەرژەوەندی خۆی خۆشەویستی تۆ پشتگوێ دەخات و

تۆ خەمبار دەکات تا خۆی دڵخۆشبێت، بیسرەرەوە با ئاسوودە بیت.ئەگەر کاتێک لە شتێکدا سەرکەوتوو دەبیت ئیرەییت پێدەبات و بە پێکەنینە ساختەکانی هەوڵ دەدات ئیرەیی بردنەکەی بشارێتەوە، بیسرەرەوە با ئاسوودە بیت.ئەگەر هاوبەشی دڵخۆشی و ئازارەکانت ناکات، بیسرەرەوە با ئاسوودە بیت.

مەهێڵە ئەم کەسانە لە ژیانتدا بمێننەوە. ئەمانە تەنها دەبن بە بار بەسەرتەوە. بۆیە بیانسرەرەوە با ئاسوودە بیت و بەردەوامبە لەسەر ڕێگەی خۆت.



**لەم ژیانەدا ناچار نیت خۆت بۆ کەس بسەلمێنیت.**
**لەبیری مەکە، چی لە دڵی مرۆڤدابێت**
**چاوەکانیشی هەر ئەوە دەبینێت.**

## تۆ موعجیزەیت

گلێنەی هەردوو چاوم، تەمەنت تەواو دەبێت. ئیتر واز لە چاوەڕێکردنی موعجیزە بهێنە. دەزانیت تۆ جوانترین موعجیزەیت؟ ئەو هەموو شتەت بەسەرداهات، خەمتخوارد، دڵت شکا، شەکەت بوویت، بەڵام ئەوەتا هێشتا لەسەر پێی خۆتیت. بە تەنها لە ناو هەموو ئەو ئازارانەوە هاتیتە دەرەوە کە دەتگوت ناتوانم بێمە دەرەوە. ئەگەر سەرەڕای هەموو ئەمانە هێشتا چاوەڕێی موعجیزەیەکیت ئەوا ناحەقییەکی زۆر بەرامبەر خۆت دەکەیت. مانەوە لەسەر پێ دوای ئەو هەموو شتە، جێهێشتنی هەموو شتێک وەک ئەوەی هیچ نەبووبێت و هەڵدانەوەی پەڕەیەکی نوێی دوای هەموو شتێ، جوانترین موعجیزەکان نین؟ ئەگەر توانیبێتت ئەمانە بکەیت واتە پێویستت بە موعجیزە نییە. بۆیە ئەگەر پێویستت بە موعجیزەیەک بوو ئەوا بچۆرە بەردەم ئاوێنەیەک. ئەو کاتە بە چاوی خۆت جوانترین موعجیزە دەبینیت.

**ئیتر چاوەڕێی ڕوودانی موعجیزەیەک مەبە.**
**بچۆرە بەردەم ئاوێنەکە و جوانترین موعجیزە ببینە.**

## گوتم؛ باشم،
## بەڵام بە زۆر ڕۆژمکردەوە.

ناتوانن بزانن هاوڕێیان، ناتوانن بزانن. ناتوانن بزانن لە ناخی کێدا چەند ئازار و خەم هەیە. ناتوانن بزانن کە ئەو کەسەی دەڵێت باشم کاتژمێر چواری بەیانی لە سووچێکی جێگاکەیدا دانیشتووە فرمێسک دەڕێژێت یان نا. ناتوانن بزانن ئەو کەسەی دەڵێت باشم ناپاکی لێکراوە یان نا. ناتوانن بزانن لە ناخی ئەو کەسەی دەڵێت باشم جێی یەک ئازاری تر ماوە یان نا. ناتوانن بزانن ئەو کەسەی دەڵێت باشم خێزانەکەی لە هەموو کەس زیاتر ماندوویان کردووە یان نا.

سەیری چاوەکانی ئەو کەسە بکەن کە دەڵێت باشم، جوان سەیری بکەن. چاوەکان درۆ ناکەن، ئەوانەی دەڵێن باشم لە ڕاستیدا باش نین. بە پێچەوانەوە، گەردەلوول لە ناو دڵیدا هەڵگیرساوە، بەڵام بۆ کەسی دەرناخات. چونکە وادەزانێت دەبێت بەهێز دەربکەوێت. وا دەزانێت ئەگەر بەهێزتر دەربکەوێت کەمتر زیانی بەردەکەوێت. بۆیە بێ ئەوەی بۆ ساتێکیش بیربکاتەوە لەوەی ئایا باشە یان خراپ، یەکسەر دەڵێت باشم. کەسی وا نەهاتە سەر ڕێگامان کە لەلای ئەوان هەست بە باشی بکەین. هەموو کەسێک هەر خەریکی وێرانکردنە... کە دێتە

سەر بونیادنان هەموو کەس بێدەنگ دەبێت. ئێستا نەک هەر کەس بیر لە چاکەی تۆ ناکاتەوە، بەڵکو هەموو کەس بەدوای کەموکورتییەکی بەرامبەرەکەیدا دەگەڕێت و چاوەڕێی هەلێکە تا ئەویش شەقێک لە کەوتووەکان بدات.

لەبیری مەکە؛ ئەو کەسانەی هەمان ئازاریان چەشتووە لە هەموو کەس باشتر لێت تێدەگەن. چونکە ئەو کاتە ئازارەکان مانایان هەیە. وە ئەو کەسەی هەمان ئازاری چەشتووە و بۆ هەمان ئازار گریاوە لە هەموو کەسێک جوانتر تەواوت دەکات. ئەوانەی تر تەنها دەڵێن؛ "لێت تێدەگەم." و هیچیش تێناگەن.



**خۆشنەویستنی کەس کەمتر بە ئازارە**
**بە بەراورد بەوەی کەسانێکت خۆشبوێت کە شایەنی نین.**
**وازم لێ هێناون با لە بێ خۆشەویستییاندا بخنکێن.**

## ئێوە منتان ئاوا لێ کرد

ماندووبووم لەوەی ئەو کەسانەی هیچ سوودێکیان بۆ من نییە بەردەوام چاوەڕێی سوودبن لە منەوە. ماندووبووم لەوەی ئەو کەسانەی یەک ڕۆژیش فیداکارییەکیان بۆ من نەکردووە، بە هیچ جۆرێک خۆیان نەخستۆتە ژێر هیچ بارێکەوە، چاوەڕێبن من خۆم بخەمە ژێر بارەوە بۆیان. هیچ لەو کەسانە تێناگەم کە منیان خۆشناوێت و چاوەڕێن خۆشمبوێن. بۆچی دەتانەوێت شت وەربگرن بێ ئەوەی هیچ شتێک ببەخشن؟ بۆ دەتانەوێت لێتان تێبگەن بێ ئەوەی ئێوە تێبگەن؟ بۆچی دەتانەوێت خۆشیان بوێن بۆ ئەوەی ئێوە خۆشتان بوێن؟ تێناگەم.

بەڵام من ئیتر هەوڵیش نادەم لێتان تێبگەم. پێشتر هەوڵم دەدا تێبگەم و ڕێگەچارەیەک بدۆزمەوە. بەڵام ئیتر ئەوەش ناکەم. کێ هاتووە، کێ ڕۆیشتووە، کێ خۆشیویستووە، کێ خۆشینەویستووە هەر بە خەیاڵمدا نایەت. ئێوە منتان ئاوا لێ کرد. ئەمە بەرهەمی ئێوەیە. هەموو نییەتە باشەکانم، خۆشەویستیم و هەستەکانمتان لەناوبرد. کاتی خۆی دێت، یەک دەبینینەوە.

**ئەگەر من ئەوانەم بکردایە کە ئێوە کردتان، هەرگیز لێم خۆشنەدەبوون.**

**من چەندین جار چانسم پێدانەوە، بەڵام نەتانبینی.**



**لە ناکاو دەتەوێت بچیتە بەردەم ئاوێنەکە و بە خۆت بڵێیت:**

**"من مرۆڤێکی چەند بەهێزم،**

**سەرەڕای ئەو هەموو شتەی بەسەرمدا هات**

**هێشتا هەر لەسەر پێی خۆمم. جارجار بەملاولادا**

**کەوتم، بەڵام هەر نەڕووخام. ئەگەر بەردبوایە شەقی دەبرد،**

**بەڵام من بەرگەم گرت."**

## کۆیلەی خۆشەویستی ڕاستەقینەم

کۆیەلەی ئەو خۆشەویستییە ڕاستەقینانەم کە قیمەتیان دەزانرێت، حەقی خۆی پێدەدرێت و هەستیپێدەکرێت. هەندێک کەس هەیە پەنا بۆ بەهانە دەبات تاوەکو کەسی خۆشنەوێت، هەندێک کەسیش هەیە دوای مردنیش بەردەوامە لە خۆشویستن. وە من بەڕاستی پێموایە هەندێک خۆشەویستی دوای مردنیش هەر دەمێننەوە. هەندێک کەسم بینی کاتێک لە ژیاندابوو، دەست و قاچی کاری دەکرد، دڵی لێیدەدا و هەستەکانی تازەبوون بە هیچ جۆرێک کەسیان خۆشنەویستووە. کەسانێکیشم بینی سەرەڕای ئەوەی خۆشەویستەکەی مردووە بەڵام بۆ ماوەی چەندین ساڵ هەر وەک یەکەم ڕۆژ پەیوەستبووە پێیەوە. ئەوا گوتم هەندێک خۆشەویستی دوای مردنیش بەردەوام دەبێت.

ئەمە چیرۆکی ژن و مێردێکە کە بۆ ماوەی چەندین ساڵ هاوسەری یەکبوون.

پیاوەکە هەموو ساڵێک لە ساڵیادی هاوسەرگیرییاندا چەپکێک گوڵی سوری بۆ ژنەکەی دەبرد. پیاوەکە هێندە ژنەکەی خۆشدەویست کە تا مردن بەردەوامبوو لەم نەریتەی خۆی.

پیاوەکە ڕۆژێک دەمرێت و ڕێوڕەسمی بە خاکسپاردنی بۆ ئەنجام دەدرێت و سەرخۆشییان لێدەکرێت، دواتر ژنەکە بێ هاوسەرەکەی، هاوڕێکەی، خۆشەویستەکەی و ئەو کەسەی چەندین ساڵە هاوبەشی ژیانییەتی بە تەنها دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. ئەم ژنە هێندە هاوسەرەکەی خۆشدەوێت کە ناتوانێت بە نەبوونی ئەو ڕابێت و هەموو ڕۆژێک بیر لەو دەکاتەوە و دەگری.

ڕۆژان دێت و ڕۆژان دەڕوات ئەمە هەر ئاوا بەردەوام دەبێت. ساڵیادی هاوسەرگیرییان دێت. ئەو ڕۆژە لە دەرگای ژنەکە دەدرێت. ژنەکە دەرگاکە دەکاتەوە، بەڵام کەسی لێ نییە. تەنها یەک چەپک گوڵی سور لەسەر زەوییەکە دەبینێت.

ژنەکە لە دڵخۆشیدا هەموو گیانی دەلەرزێت و چەپکە گوڵەکە هەڵدەگرێت. ژنەکە خەریکە ببورێتەوە کاتێک تێبینییەک لەسەر گوڵەکان دەبینێت و بە ترسەوە دەست دەکات بە خوێندنەوەی؛ "ژنە ئازیزەکەم، دەزانم ئەمە سوپڕایزێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە بۆت، بەڵام دەمەوێت بزانیت تۆ هەموو کاتێک نزیکترین هاوڕێی من بوویت، هاوبەشی خەمم بوویت و عاشقەکەم بوویت. وامەزانە بە مردن وازم لە خۆشویستنی تۆ هێناوە. هیوای ژیانێکی خۆش و پڕ خۆشەویستیت بۆ دەخوازم. تکایە ژیانێکی خۆش بژی و زۆر بیر لە من مەکەرەوە. هەتا ئەو ڕۆژەی تۆ پەسەندی بکەیت ئەم گوڵانەت بۆ دێت. تا ئەو ڕۆژەی گوڵفرۆشەکە تۆ لە ماڵەوە نابینێت. ئەو ڕۆژە پێنج جار دێت و ئەگەر هەر تۆی نەدۆزییەوە

ئەوا دەزانێت هاتوویت بۆلای من. هێشتا تۆم زۆر خۆشدەوێت. هاوسەرەکەت".

ژنەکە وادەزانێت ئەمە گاڵتەیەکی ناخۆشە و یەکسەر تەلەفۆن بۆ گوڵفرۆشەکە دەکات، پرسیاری لێ دەکات. گوڵفرۆشەکەش باسی هەموو شتێکی بۆ دەکات و دەڵێت: "خانمەکەم، هاوسەرەکەت هەموو ساڵێک لەم گوڵانەی بۆ دەناردیت و پێی گوتم کە ئەو مرد هەموو ساڵێک لە هەمان ڕۆژدا ئەم گوڵانەت بۆ بهێنم و ئەو کاتەش پارەی ئەمانەی بەزیادەوە دا".

ژنەکە خەریکبوو تەلەفۆنەکەی لێ دەکەوتە خوارەوە کاتێک دایخستەوە و بە گریانەوە باوەشی بە گوڵەکاندا کرد...



**خۆشەویستی گەنجینەیەکی بێ پایانە.**

**خودا بکات خۆشەویستییەکی ڕاستەقینە بهێنێتە سەر ڕێگەی هەموومان...**

## ئارەزووی بکە و بەدەستی بهێنە

کێشە تەنهایی نیە، کێشەکە تۆیت. هەبوونی کەسێک لە ژیانتدا یان نەبوونی، هیچ گرنگ نییە. باوەش بە خەیاڵەکانتدا بکە لە جیاتی مرۆڤەکان و ئەوان بەدیبهێنە. بۆ ئەمە پێویستت بە هیچ کەسێک نییە. تۆ بەسیت بۆ خۆت. مەبە بە یەکێک لەو کەسە سادانەی تاکە ئاواتیان ئەوەیە کەسێکی ڕاست بدۆزنەوە و هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەن وماڵێک پێکەوە بنێن. ناڵێم هاوسەرگیری مەکەن. بێگومان هاوسەرگیری بکەن و ماڵ پێکەوە بنێن، ببنە خاوەنی منداڵ. خێزان هەموو شتێکە. بەڵام پێش ئەمە هەندێک شت بۆ خۆتان بکەن. بۆ نموونە با هەندێک شت هەبێت کە دوای مردن لە دوای خۆتان بەجێی بهێڵن. با ئامانجێکت هەبێت. شوێنێک هەبێت کە دەتەوێت پێی بگەیت و خواستێکت هەبێت کە دەتەوێت بەدیبهێنیت. بەڵام ئەوەش بزانە کە تەنها بە ویستن هەموو شتێک نابێت.

تەنها ویستن بەس نییە، دوای هەموو ئەو شتانە بکەوە کە دەتەوێت بیانهێنیتە دی. با کەمێک ڕوونتری بکەمەوە.

هـەروەک هەموو کەسێک منیش چیرۆکێکی خۆمم هەیە. وە چیرۆکی هەرکەسێک بۆخۆی سەختە. بێگومان هەندێک کاتی سەختیش لە چیرۆکەکەی مندا هـەبووە. مـن چەندین ساڵ لەمەوبەر خەیاڵی کتێبنووسینم دەکـرد. هەموو ڕۆژێـک بە توندی باوەشم بەم خەیاڵانەمدا دەکرد. هەموو کەس گوتیان "کێ کتێبی تۆ دەخوێنێتەوە؟" ئەو ناوەندی بڵاوکردنەوانەی چووم بۆلایان دەستیان بەڕوومدا نا، گوتیان کەس کتێبی تۆ ناکڕێت و نایانخوێننەوە. بەڵام ئەم دۆخە نەبووە هۆی کۆڵدانی مـن. بە پێچەوانەوە بەهێزتری کـردم و مـن توندتر باوەشم بە خەیاڵەکانمدا کرد. سەرەتا ویستم. دواتریش هەوڵمدا بۆ بەدیهێنانی و سەرکەوتم. خەیاڵەکەمم هێنایە دی و جگە لە خوێنەرەکانم هیچ کەس لە پشتم نەبوو. واتا دەمەوێت بڵێم، هەمیشە بەمنیان دەگوت؛ "ئەم کوڕە نابێت بە پیاو." چونکە باوکم نەبوو، بەڵام هەموو ئەو کەسانەی وایان دەگوت ئێستا کتێبەکانم دەخوێننەوە.

خێزانەکەشم بەشێکن لەو کەسانە و هەموو ڕۆژێک فشاریان دەخستە سەر دایکم تا من بدات بە لانەی بێسەرپەرشتان. هیچ شتێک نییە مەحاڵ بێت. شتی قورس هەیە، بەڵام ئێوە دەتوانن ئەوەش بەدەستبهێنن. پێت دەڵێن ناتوانیت بیکەیت، بەڵام خۆیان هەوڵ دەدەن بیکەن. هەوڵ دەدەن پەشیمانت بکەنەوە، بەڵام تۆ هەر پەشیمان نابیتەوە. چاوەڕێن بدۆڕێیت و وازبهێنیت، بەڵام تۆ هەر کۆڵنادەیت. بە وازنەهێنان و مانەوەت لەسەر پێی خۆت

دەبێتە جوانترین وەڵام بۆیان.

لەبیری مەکە، ئەگەر وازبهێنیت کەسانێک دەیبەنەوە کە شایەنی نین. سەرەتا دەتەوێت دواتر هەوڵی بۆ دەدەیت. دواتریش بەدەستی دەهێنیت. کە بەدەستیشت هێنا لە خۆت ناگۆڕێیت. زۆر ڕاستگۆیانە پێت دەڵێم؛ تەنها لەبەر ئەوەی باوکم نەبووبوو بە منیشیان دەگوت؛ "ئەمە نابێت بە هیچ". بەڵام سەیرکەن ئێستا ئێوە کتێبەکانم دەخوێننەوە.

**واتا دەمەوێت بڵێم**

**ئارەزووی بکەن و بەدەستی بهێنن.**

## جگە لە خۆت پێویستت بە هیچ کەسێکیتر نییە.

**بیر لە خراپترین ڕۆژت بکەرەوە، یەک دونیا کەس پێیان گوتیت؛ "لەلاتم".**

بەڵام هەر بەتەنها ناپاکیت لێ نەکرا؟ کەوتیت و خۆت هەڵنەستایتەوە سەر پێ؟

پڕبوویت و بە تەنها نەگریایت؟ لێت دەپرسن؛

ئایا بەشی پێویست ناحەقیت بەرامبەر خۆت نەکردووە

لەبەر کەسانێک کە هیچ شایەنی نین؟

مرۆڤەکان دێن و دەڕۆن. لە بیری مەکە، کەس لە تۆ زیاتر بیر لە تۆ ناکاتەوە. ئەوانەی دەڵێن نارۆم، دەڕۆن بەڵام تۆ هەر دێیتەوە سەر خۆت. دەکەویت، بەڵام خۆت هەڵدەستیتەوە سەر پێ. بریندار دەبیت، بەڵام خۆت برینەکانت سارێژ دەکەیت. لە ناو ئەو هەموو ئازارەوە بە تەنها دەردێیت. پێویستت بە باوەشێک دەبێت، بەڵام هەر باوەش بە خۆتدا دەکەیت. دەردەکانت دەتسووتێنن، وەک باڵندەی 'فینێکس' لە خۆڵەمێشەکەتەوە لەدایک دەبیتەوە.

تەنیاحاجی

# Tanya Haji | تەنیاحاجی

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

**ئەم کتێبە لەلایەن "هەمیشە جەبار" کراوە**

**بە pdf و پێشکەش بە خوێنەران کراوە**

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7

